## پێشەکی:

کتێبی( خواوەند و خوابانوانی ئەفسانەی یۆنانی) گواستنەوەی ئەو پەیڤانەیە کە گوتراون و نوسراون لەسەر ئەفسانەی یۆنانی، وەرێکخستنیەتی لە بەرگێکدا بەشێوەیەکی سادە، تا هەمووان لێی تێبگەن و شێوازی دارشتنیشی بەجۆرێکە کە کەمترین گیروگرفتی"تێگەشتن" دەهێنێتە بەردەم خوێنەرەکەی، گرنگی ئەم کتێبە کە هەستاوم بە کۆکردنەوە و دارشتنی لە گرنگی خوودی ئەفسانەکان بەگشتی و ئەفسانەی یۆنانی بەتایبەتیە. لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە ئایا گرنگی ئەفسانەکان لە چیدایە؟ رۆڵی ئەفسانە لەوەدایە کە کاریگەری لەسەر رۆح و ناخی مرۆڤەکان بەجێدەهێڵێت، واتە ئەوەی ئێمە لەئەفسانەوە بەدەستی دەهێنین بایەخی دەبێت بۆمان، نهێنی ئەودیوی دەقە ئەفسانەییەکانە، ئەو کاریگەرییە گشتگیر و قوڵەیە کە کەلەسەر هەست و نەست و قەناعەتی کۆی مرۆڤەکان دروستی دەکات، هەرچەندە مرۆڤ بانگەشەی ئەقلانی بوون بکات لافی ئەوە لێبدات کە دوورە لە کەوتنە ژێر بابەتە رۆحیی و میتافیزیکیەکان، بەڵام بەجۆرێک لەجۆرەکان هەرگیز لەو کاریگەری و هەژموونە دەربازی نابێت، ئەم بابەتەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەفسانە دەیەوێت بەرەو نهێنییە ناوەکییەکانی خۆمان ئاراستەمان بکات، رێگەنادات کۆیلەیی بوونە مادییەکان ببین. ئەفسانە خوازیارە کە لایەنە مرۆییە راستەقینەکان فەرامۆش نەکەین و وەک مرۆڤ بژین و مامەڵە بکەین، ئەخلاقی مرۆیی نەخەینە لاوە و دوور لە ئیستاتیکای بوون نەژین، وەلەوە تێبگەین کە دونیای ئێمەی مرۆڤ گەلێ فراوانتر و قوڵتر و مانادارترە لەوەی لەئێستا تێیدا دەژین، بۆ ئەوەی چیتر بەبێ خەون نەژین، یاخود تەنها لەو خەون و خولیا سادە و ساکارانەدا نەمێنینەوە کە بەهایی (بوون)مانی کەم کردۆتەوە و ژیانمانی بەرەو رۆتینێکی سارد و سڕ و بێمانا بردووە، لەچوارچێوەی واقیعێکی تەسکدا بەندی کردووین.[1]

یاخود دەتوانین گرنگیەکی تری ئەفسانە لەوەدا ببینینەوە کە خەڵکی دەڵێن ئێمە بەدوای مانایەکدا وێڵین بۆ ژیان[2] . بەهەر شێوەیەک بێت هەموو شتێک گرنگی خۆی هەیە، گەر گرنگیشی نەبێت بەو مانایە نایەت کە من هەڵەم کردووە لە دارشتنی ئەم کتێبەدا، چوون گرنگی دان بە بابەتێک بەو مانایە نایەت کە ئەو بابەتە گرنگە، وە گرنگی دان بەبابەتێک کە لەناو خەڵکدا ناگرنگە ئیتر بەمانای ناگرنگی ئەو بابەتە نایەت.

[1] کتێبی (ئەفسانە و مەعریفە/نوسینی: خەسرەو میراودەلی/ لاپەڕە 37)

[2] کتێبی ( دەسەڵاتی ئەفسانە/ گفتوگۆیی؛ بیڵ مویرز لەگەڵ جۆزێف کەمبڵ/ لا27 و 28)

# (خاۆس چییە؟)



به یۆنانی:Χάος

به ئینگلیزی: Chaos

**خاۆس**، یان بارودۆخی ناڕوون و پرژوبڵاوی سەرەتا و ئەزەلی، یەکانە و ئەوەڵین بوونە، لەئەفسانەی یۆنانیدا، ئاشکراکەر و ئافرێنەرێکی بنچینەیی بێ شێوە و ناوەڕۆک و خاڵیی و بەربڵاوبوو، کەلە ئەفسانەکاندا بە بەرپاکەری سەرەتای هەموو هەبووەکان باس کراوە، کە هەموو شتێکی ئافراندووە و ئەوەی هەیە و نییە بەیانی کردووە و سەرەتای پێ بەخشیوە، خاۆس لە ئەفسانەی یۆناندا لێکۆڵەران هەندێکیان دەڵێن هاتۆتە بوون پێش هەموو هەبوویەک و هەندێکی تریشیان باوەڕیان وایە کە خاۆس هەر هەبووە و نەک نەبووبێت و هاتبێتە بوون، بەهەر شێوەیەک بێت خاۆس ئەوەی ڕونە کە پێش هەموو بەدیهێنراوەکان هەبووە و چاوگە و سەرچاوەی هەموو ئەو شتانەیە کە هاتوونەتە بوون بەخواوەندانیشەوە.

# (گایا)



بەیۆنانی:Γαία

بەئینگلیزی:Gaia

**گایا** خوابانویەکی نێو ئەفسانەکانی یۆنانە،خوابانوی زەمینە، یەکێکە لە ئەزەلیترین و یەکەمین و سەرەتایترین خوابانوەکانی "بوون/وجوود" ،دەڵێن زادەی (خاۆسـChaos)ە، گایا ئۆرانوسی وەک هاوسەری خۆی هەڵبژارد کە کوڕ و زادەی گایا خۆی بوو، 6کوڕ و6کچی لە ئۆرانوس بوو، منداڵەکانی گایا و ئۆرانوس سەر بە (تیتانەکان)[3]بوون، زۆرینەی ئەم منداڵانەی کە بەهۆی پەیوەندی خواوەند ئۆرانوس و خوابانو گایاوە هاتنە بوون؛ لە جۆری (سیکلۆپ)[4] و جانەوەری وەحشی زل و ناپۆڕ بوون[5] ئەوە خوابانو گایا بوو کە زیوسی فەرمانڕەوا و بەدەسەڵاتی ڕزگارکرد لە خرماندن و لەت و پەتکردن؛ بە دەست و ددانی(کرۆنوس)ی دڕندە، دوای ئەوەی کە خواوەند

[3] تیتان یان تایتان؛ ناوی کۆمەڵە خواوەندێکە لە نەژادەکانی ئیلاهەتی یۆنانی کۆن، ئەم کۆمەڵەیە پێش دەسەڵات گرتنە دەستی خواوەندانی ئۆلۆمپ بوونیان هەبوو، کە لەدوایدا باسی دەکەم.

[4] بوونەوەرێک بوون کە وەک دێو(غول) وابوون و گەورە بوون، وە یەک چاویان هەبوو، چاوەکەش لەناوەڕاستی تەوێڵیان بوو، لە بەشەکانی دواتردا باسی سیکلۆپەکانیش کراوە.

[5] لەئەفسانەی یۆنانیدا ناویان بە (هیکاتۆنچیرس) هاتووە.

زیوس هاتە بوون، خوابانو گایا هاوکاری خوابانو(ڕییا)[6] ی کرد کە بەردێک بێنێت و لە مەتۆلکەی خواوەند زیوس دای بنێت و جەم و جوری کات تا وەک زیوس دەربکەوێت و کاتێ خواوەند (کرۆنوس) هات وابزانێت ئەمە زیوسە و بەردەکە لەجێگای زیوس بخوات. (کرۆنوس) هەر منداڵێکی ببوایە لە هاوسەرەکانی لەناوی دەبرد و لەت و پەتی دەکرد و دەیخوارد بەدەمی خۆی، لەبەر ئەوەی زانیبووی کە لەداهاتوودا بەدەستی یەکێ لە نەوەکانی خۆی نابووت دەکرێ و تەختی دەسەڵاتی لێ دەسەندرێتەوە، بەڵام حیلە و فێڵی خوابانو (گایا) ئیشی خۆی کرد و خواوەند زیوس ڕزگاری بەدەست هێنا بەهۆی پێشنیارەکەی خوابانو (گایا) بۆ خوابانو (ڕییا).

[6] خوابانویەکە لەئەفسانەکانی یۆنان و یەکێکە لە هاوسەرەکانی خواوەند (کرۆنوس)و دایکی خواوەند (زیوس)ە.

# (ئۆرانوس)



بەیۆنانی:Οὐρανός

بەئینگلیزی:Ouranos

**ئۆرانوس** لە ئەفسانەکانی یۆناندا،خواوەندێکی هەڤرات بە ئاسمانە،ڕاستە هاوسەری خوابانو گایایە،بەلام هەر لەسەرەتاوە بەهۆی خوابانو گایاوە هاتە بوون،دوای هاتنەبوونی بوە هاوسەری گایا، ئۆرانوس تەواوی منداڵانی خۆی و گایای دوای هاوسەرگیری لە(تارتارۆس/واتەجەهەنەم) زیندانی دەکرد، ئەم کارەشی زۆری نەخایاند بووە هۆی نارەحەتی خوابان و گایا، گایاش هەرگیز خواوەندێکی مت و بێ حیلە نەبووە، سەرەڕای بەخشندەی وزیرەکیەکەشی کە لە عەدالەتدا بەکاری دەبرد، وزۆر کات هۆکاری ڕزگاریی زۆرێک لە خواوەندان بووە لەئەفسانەکاندا، گایا دوای ئەوەی بینی هەر منداڵێکیان دەبێت خواوەند ئۆرانوس لە تارتارۆس زیندانیان دەکات، پێشنیاری کرد بۆ کوڕەکانی کە مقابەلە و گفتوگۆ لەگەڵ خواوەند ئۆرانوس بکەن، بەڵام هیچ کام لەکوڕەکانی بەدەم داواکەیەوە نەهاتن، کرۆنوسی لێ دەرچێت، دوای ئەوە کرۆنوس نەجاتی بوو لە تارتارۆس، ڕۆژێ کەفتە تەگبیری لەگەڵ خوابانو گایا لە ئەنجامدا کرۆنوس بڕیاری دا تەمێی خواوەند ئۆرانوس بکات و لەکۆڵی کاتەوە و دایک و وابەستەگانی خۆی نەجات دا لەدەستی، گایای حیلەباز و خوابانوی زەمین، هەستا بە داتاشینی ڕێگایەک بۆ کرونوس، داسێکی زەخمی لەبەرد سازکرد و بۆی لەهەسانێ دا، هەرچەندە کەم تازۆر دڵگران بوو لەوەی کە کرۆنوس کەتنێ خراپ دەنێتەوە بەم داسە، بەهەر ڕێگایەک بێت خراپ ئۆرانوسی هاوسەری پەک دەخات، بەڵام ئەویش لەپێناو ڕزگاری

منداڵەکانی لە تارتارۆس کە ئۆرانوس بوو بوە بایسی ئەشکەنجەیان، داسە کەی دایە دەست کرۆنوس و کرۆنوسیش کەمینێکی کوشندەی بۆ ئۆرانوس دانا و کەمینەکەش بەم شێوەیە بوو: ئۆرانوس هات و بەنیازی حەسانەوە و جووت بوون ویستی ڕاکشێ لەگەڵ گایادا و کرۆنوسی ساحێب کەمینیش گون(هێلکە گوند)ی ئۆرانوسی خواوەندی گرت و زەربەیەکی لێدا و داغانی کرد، پاشان هێڵە گونەکانی فرێ دایە دەریاوە، ئەڵێن کاتێ کە کەوتە نێو دەریا و خوێناو تۆوەکانی بڵاوبویەوە، نیمچەخواوەند و خواوەند و ئەنواع و ئەشکاڵ شت دروست بوو لێی ، کە خواوەندەکان بەتایبەتی زۆرینە یان خواوەندی تۆڵەسێن دەرچوون (واتە بوونە خواوەندی تۆڵە) ، وەهەندێ لە ئەفسانە زەعیفەکانیش دەڵێن کە خوابانو ئافرۆدیت لەو تۆماو و خوێناوەوە هاتۆتە بوون، لەو کاتەشدا کە ئۆرانوسی خواوەند خەسێنرا و گونی نەما و هێزی نەما و شەخسیاتی نەما ، وتی پێش بینی دەکەم ئەوەی بەسەرت هێنام کرۆنوس بەسەرت بێتەوە.

# (کرۆنوس)



بەیۆنانی:Κρόνος

بەئینگلیزی:Cronus

**کرۆنوس** لەئەفسانەکانی یۆناندا بە پادشای تیتانیەکان هاتوەتە هەژمار، لەسەرەتای دروست بوونیەوە هەندێ ئەڵین لەبۆشایەوە هاتۆتەبوون و هەندێ تر ئەڵین لە خائۆسەوە هاتۆتە بوون کە هەردووکیان کەم تازۆر یەک مانا دەگەیەنن[7]، لەهەرکامیانەوە بێت، خواوەند کرۆنوس کوڕی خوابانو (گایا)یە، بەڵام ڕونکردنەوەیەک لێرەدا بابدەم:

کە بۆ ئەم خواوەند و خوابانوە سەرەتایانە ئەڵێم لە خائۆسەوە هاتوون یان لە خواوەند خائۆسەوە هاتوون ، بەمانای ئەوە نایەت کە خائۆس کەسایەتیەک بێت وەک باقی خواوەندانی تر ، نا..

لەخائۆس بوون بە دوو مانا دێت (یەکەمیان:واتە لەتاریکیەوە هاتنە بوون/دووەمیان واتە: لە هیچ و نەبوونەوە هاتنە بوون یان لە بۆشایەوە هاتنە بوون) ، خابانو (گایا)ش ، بۆیە پێی ئەوترێ یەکەمینەکان یان سەرەتاییەکان ، چوون لە هیچ و نەبوونەوە هاتوەتە بوون ، و بەهۆی گایا شەوە سێ خواوەند هاتوونەتە بوون :

1- ئۆرانوس/ئاسمان

[7] بڕوانە لاپەڕە 4ی ئەم کتێبە.

2- پۆنتوس/دەریا

3- ئۆرئوس/کەژوکێو

ئاسمان(واتە:ئۆرانوس) و زەمین(واتە:گایا) ، پێکەوە یەکیان لەباوەش ئەگرت و لەم باوەش باوەشێنەی ئاسمان و زەویشدا ، 12منداڵی تیتانی ئافرا ، سیان لەو منداڵانە غولی یەک چاو دەرچوون و سیانی تریان غولی 100دەست دەرچوو و ماباقیەکەش هەردانە و لەڕەنگێ دەرچوو. ئۆرانوس کە لە ڕاستیدا باوکی ئەم 12 تیتانییە بوو ، بەڵام زۆری ڕق لێیان بوو و چاوی پیایان هەڵنەدەهات ، وە هەر ئەم ڕقەشی وای کرد ئەم منداڵانە لە (تارتارۆس)[8] زیندانی بکات ، ئەم کارەی ئۆرانوسیش بووە بایسی تورەی گایا خوابانو زەمین ، وە لە تیتانیانی خواست کە تۆڵە لە ئۆرانوس بکەنەوە ، تەنها تیتانیەک بەدەم داواکەیەوە هات ئەویش (کرۆنوس)بوو ، کە بچوکترین تیتانی بوو ، بە داسێک گەڵ و گونی ئۆرانوسی خواوەندی بڕی و فڕیی دایە دەریاوە ، دوای ئەم کارەی کرۆنوس بە سەڵتەنەت و پاشایەتی گشتی خودایان گەشت، بەڵام ملهوڕانە وتی من تیتانیان لە تارتارۆس نەجات نایەم و ناشهێڵم بێنە دەرەوە، گایاش ئەمەی زۆر پێ ناماقوڵ بوو، بۆیە پێشبینیەکی کرد هاوشێوەی ئۆرانوس کە وتی: بەدەردی من چیت کرۆنوس، گایا وتی : تۆش وەک ئۆرانوس بەدەستی منداڵی خۆت سەرت تێ ئەنێیت و لەناو ئەچیت ، کاتێ کە کرۆنوسی
سەرتەختی پاشایەتی خودایان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ خوابانو (ڕیئا) کە خوشکی خۆی بوو، چەند نەوەیەکی لەم خوابانوە بوو هێنایە بوون، بەناوەکانی:

- هێستیا
- دیمیتێر
- هیرا
- هادیس
- پۆزیدیۆن
- زیوس

بەڵام کرۆنوس ، بۆ ئەوەی پێشبینیەکانی ئۆرانوس و گایا نەیەتەدی ، هەرکات منداڵی ئەبوو هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ ئەوەی بە قەپ و بەزەبری ددانان لەتوپەتیان کات و پارچەکانیان قوت بدات ، بەڵام کاتێ خواوەندی خواوەندان زیوسی بەشکۆ لە دایک بوو ، خوابانو (ڕیئا) دایکی زیوس ، داوای کۆمەکی لە ئۆرانوس و گایا کرد تا ڕێگا بگرن لە خواردنی زیوس لە لایەن خواوەند

[8] دنیایی ژێر زەمینی و پڕ لەنەهامەتی یان دونیای ناخۆش تاریک (جەهەنەم).

کرۆنوسەوە ، گایاش داواکاریەکەی قبوڵکرد ، بۆیە کاتێ سەرەی خواردنی زیوس هات ، ڕیئا بەردێکی گەورەی بەکرۆنوس دا و کرۆنوسیش وای زانی ئەم بەردە گەورەیە زیوسە ، وە ئەو بەردە گەورەیەی لە جێگای زیوس قوت دا ، دواتر ڕیئا زیوسی بردە دورگەی (کریت)[9] و لەوێ گەورەی کرد ، کاتێ کەزیوس گەورە بوو ، دەرمانێکی ڕشانەوە هێنەری دەرخواردی کرۆنوس دا کە ئەو دەرمانە بوە بایسی ئەوەی ئەو منداڵانەش کە پێشتر خواردویەتی بیهێنێتەوە ، ئەم کارەش هەر بەو ئاسانییە نەکرا و 10 دانە ساڵ جەنگ بەرپا بووە لەسەر ئەمە لە نێوان تیتانیان و منداڵەکانی کرۆنوس کە لە ئەنجامدا ، کرۆنوس شکستی خوارد و پادشایەتی بۆ زیوس و برا و خوشکەکانی مایەوە و دابەش بوو.

---

[9] دورگەیەکە سەر بەیۆنان.

# (ڕێیا)[10]



بەیۆنانی:Ῥέα

بەئینگلیزی:Rhea

**ڕێیا** یەکێکە لە خوابانوەکانی ئەفسانە هەرە کۆنەکانی یۆنان و نەوەی خوابانو (گایا)یە، خوابانوی ڕۆشنایی و ڕوناکی و خۆرە، ریئا خوشکی کرۆنوس بوو لەهەمانکاتیشدا هاوسەری بوو، دایکی (دیمتێر و هادیس و هێرا و پۆزیدیون و زیوس)بوو، بەزۆری لەنێوان دوو شێری ترسناکدا دادەنیشت و ئەرابەیەک یان تەختێکی هەبوو لەبەینی ئەو دوو شێرەدا لەوێ ئەسرەوت.

کرۆنوسی هاوسەری ڕێیا بە ئایندەی گەشی پێشبینیکراوی منداڵانی ریێیا حەسوودی دەبرد، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش هەرکات منداڵی دەبوو قەپ ئاژنی دەکرد و پارچە پارچە قوتی دەدان، بەڵام کاتێ زیوس لەدایک بوو، ڕێیا داوای هاوکاری لە خوابانو گایا کرد تا نەهێڵن زیۆسی خواوەند بەر ددانی بێ ڕەحمانەی کرۆنوس بکەوێت و لەبەین بڕوات ، بەحیلەی خوابانو(گایا)، ڕێیا هەستا بە دانانی بەرد لەنێو مەتۆلکەی زیوس و لە ئەنجامدا کرۆنوس بە یەک قوتدان بەردەکانی ئاودیوی مەعیدەی کرد و وای زانی زیوسی بەشکۆیە، ئیتر دوای ئەوە ڕیئا هەستا بە شاردنەوەی زیوس بۆ دورگەیی (کریت)و لەوێ بەخێوی کرد تا گەورە بوو.

---

[10] وێنەکە داتاشراوێکی کۆنی یۆنانە، تێیدا دەرکەوتووە کە ڕێیا منداڵێکی دەداتە کرۆنوس تا لەناوی بەرێت وەک پیشەی هەمیشەی نێوان خۆی و کرۆنوس.

# (زیوس)



بەیۆنانی:Ζεύς

بە ئینگلیزی:Zeus

**زیوس**، لەئەفسانەکانی یۆناندا، پادشای هەموو خودایانە، بەڵام لە ئەفسانەکانی ڕۆم دا ، زیوس بە (ژوپیتێر/جوپیتیر) ناودەبرێت و خواوەند جوپیتر هەمان کاری زیوس ئەکات لای ئەوان ، وەلەئەفسانەکانی کریتیشدا بە(ڤلیخانۆس) ناودەبرێ، زیۆس جوانترین و بەهەیبەتترین و بەشکۆترین منداڵی خوابانو (ڕیئا) و خواوەند(کرۆنوس)بوو، هەروەها لە دواتردا و لەسەر زەوی بووە گەورەترین فەرمانڕەوای(کێوی ئۆلۆمپ)، وەبووە خواوەندی یەکەمین لەتەواوی ئەو مەعبەدانەی کە لە بناری کێوی ئۆڵۆمپ و سەر کێوی ئۆڵۆمپ بیناکرابوون، سەرەرای ئەمانەش بووە گەورەترین و زاڵترین خواوەند بەسەر ئاسمان و زەوی و ژێر زەوی واتە تارتارۆس، ئەوە زیوس بوو کە قانون و عەدالەتی چەسپاند، لەنێو ئاسمان و لەسەر زەویدا، هەروەها یەکێکە لەو خواوەندانەی کە ڕۆڵی کاریگەری هەیە لەبەرزکردنەوەی مەعنەویتی پەرستیاران و جەنگاوەران و

ئەو کەسانەی کە هانای بۆ دەبەن، هەر لەبەر ەم هۆکارەش زیوس لە ئەفسانەکانی یۆناندا سەرەڕای ئەو هەمووە زاڵیەتی و دەسەڵاتەی کەهەیەتی، بەگەورەترین ڕابەری ڕۆحانی خودایان و ئینسانەکانیش دادەنرێت لە بووندا.

زیوس سەرەتا پادشای ئاسمانەکان بوو، وەلە بنچینەدا بەناونیشانی خوجای ئاسمان و هەوا لەلایەن قەبیلە دێرینەکانی یۆنان ئەهاتە پەرستن. بەڵام لەدواتردا بووە ئەو خواوەند و کەسایەتییەی کە هەرخۆی پاشای پاشاکان بێت و هەرخۆی خودای خودایان بێت.

بنەچەی ناوی زیوس دەگەڕێتەوە بۆ دەستەواژەی(Dios) کە بەمانای (درەخشان)دێت. درەخشانیش تەنها لەجوانی و بەشکۆی ئەو ڕەنگناداتەوە، بەڵکو لەهەموو ڕویەکەوە کەبە مێشکی ئینسانەکاندا بێت و نەیەت ئەو بەهەیبەت و گەورە و بەدەسەڵاتە، دەسەڵاتێکی تەواو ڕەها، بەڵام ڕەهاییەتێک نا کە (الله ئاسا بە ببە بویەک دنیا سەرەو ژێرکات..نا بەڵکو بە شێوەیەک کەدەجەنگێ و کوشتار دەدات و هێز دەنێرێت وکاری مرۆڤ ئاسا ئەکات بەڵام بەهێزێکی فراوانتر و گەورەترەوە)

هێما و چەکی دەستی زیوس هەورەبروسکەیە، هەروەها نیشانەکانی دەرکەوتنی ئەو لەکاتی گێرمەو کێشە و پێشهاتە باش و خراپەکانی زەویدا هەڵۆیە ، واتە بۆنمونە کاتێ یەکێ ئەڵێ ( زیوس تۆڵەت لێ بستێنێت چوون کمنت چەوساندەوە و ئەوی تریش کە زاڵمەکەیە ئەڵێ : زیوس ناتوانێت یان تۆلەم لێ ناکاتەوە و لەو کاتەدا هەڵۆیەک لەو نزیکانە دەر بکەوێ ئیتر وای بەحاڵی چارەنوسی کەسی زاڵم و هەر ئەبێ باجی ئەو قسەیەی بدات ..)

لەنێو هونەرمەندان و پەیکەرتاشانیشدا، زیوس زۆر کات بەشێوەیەکی بەتەمەن دەکێشرێت و دەتاشرێت، بەڵام ئەگەر لەهەموو پەیکەرو کێشراوەکانی زیوس ورد بینەوە، ئەو تەمەنی زۆر نییە، تەنها قژوریشی سپییە ئەنا پاقلاوەی سفتی لە سکدا دەبینین و مەمکی جوان و بەرز و شانی پان و دەموچاوی بێ چرچی دەبینین، هەر بۆیە زیوس تەنها قژ وریشی سپییە، ئەنا بەتەمەن و پیر نییە. کێشراو و داتاشراوەکانی زیوس زۆر و زەوەندەن بەڵام باشترین و جوانترین پەیکەری زیوس ، داتاشراوێکە لە مۆزەخانەی (ئارکیولاجیکاڵ/لەئاتین) و لەوێ دانراوە، لەزوودا وا گومان دەبرا کە ئەوە پەیکەری پۆزیدیۆنە بەڵام دواتر کە پەیکەری پۆزیدیۆن و ڕمە سێشاخە ئەهریمەن ئاساکەی دۆزرایەوە و پەیکەرەکەی زیوسیش ئاسەواری هەورەتریشقەیەکیان پێوە بینی دڵنیا بوون کە ئەوە زیوسە.

نەبەردی زیوس لەگەڵ کرۆنوسی دڕندەدا:

کرۆنوس بە هۆی ئەو پێش بینیانەوە کە پێشتر کرابوو بۆ نەوەکانی تێگەشتبوو لەوەی کە بەدەستی نەوەیەکی لەبەین دەچێ و نابووت دەبێت، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە هەر منداڵێکی ئەبوو قوتی ئەدا، بەڵام زیوسی خواوەند کەمنداڵی شەشەمی بوو، بەهۆی خوابانوانی وەک (ڕیئا/کەدایکی بوو) وە(گایا) نەجاتی بوو، دوای ئەوەی زیوس گەورە بوو، بڕیاری تۆڵەی دا لە باوە کرۆنوسی و لەگەڵ وی و باقی تیتانیاندا چووە جەنگێکی گەورەوە، سەرئەنجام زیوسی خودای خودایان شکستی بە تیتانیان و کرۆنوس هێنا، ئەو منالانەش کە قوت درابوون و بریندارکرابوون بەدەست و دەمی کرۆنوس و قوت درابوون، لەڕێگای دەرمانێکی مەعجونی کە (میتیس) دروستی کردبوو، لە ورگی کرۆنوس هێنایانە دەرەوە و پێیان هەڵهێنایەوە، و دوای ئەوەش زیوس، کرونوسی تا ئەبەد لە (تارتارۆس/جەهەنەم) زیندانی کرد، وە پادشایەتی ئاسمان و زەویشی لەنیوان خۆی و براو خوشکەکانیدا دابەش کرد، بەڵام ئەم دابەش کردنە بە قورعە کێشان بوو، لەئەنجامدا فەرمانڕەوای ڕەها و گشتگیری هەموو بوون بەزەویشەوە بەر زیوسی بەشکۆ کەوت و بووە پادشای پادشایان و دەسەلاتداری دەسەڵاتداران و خودای هەموو خودایانیش.

زیوس بەهۆی پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانیەوە منداڵگەلی فرەو فراوانی هەبوو، (میتیس) ئەوەڵین هاوسەری زیوس بوو، لە میتیس (ئاتینا)هاتە بوون، وە دوای ئەوە زیوس لەگەڵ خوشکی خۆی واتە(هیرا) هاوسەرگیری کرد و لەگەڵ هیراش (ئارس و هێفائیستوس و هیبا و ئێلیتویا)ی هێنایە بوون، ئیتر لە زۆر شوێنی تر زیوس لەسەر زەوی و ئاسمانیش جووت بووە و خواوەند و نیمچە خواوەندی هێناوەتەبوون، بۆنمونە لەگەڵ (لیتۆ)ش دا جووت بووە و (ئەپۆلۆن و ئارتمیسـ)ی لەویش هێناوەتە بوون، لەگەڵ (دانائـ)یشدا پەیوەندی هەبووە و (پرسیۆسی)هێناوەتە بوون و ...گەر بمەوێت نەوەکانی زیوس بنوسم یەک کتێبی تایبەتی دەوێت بۆیە ئەوەنەی گرنگە نوسیومە و بەسە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم باسێکی پوخت و وردی (شوجاعەلدین شیفا) دانێم؛ کەدەربارەی خواوەند زیوس کردوویەتی و لە کتێبەکەیدا نوسیویەتی دەربارەی ئەم خواوەندە:

زیوس؛ خواوەندی یۆنانییەکانە، دواتر ڕۆمییەکان بە جوپیتێر ناویان دەبرد، گەورەترین خوای نێو ئەفسانەکانی یۆنانە و پاشای پاشایانە، زۆربەی زۆری خوداکان و زۆربەی زۆری خەڵکی یۆنان و لەدوایدا ڕۆمیش گوێ لەمشت و پەرستشکاری ویستی ئەو بوون، هەرچەندە هەنێ لەخواوەندانی تر هەوڵیان دەدا گوێ ڕایەڵی لەفەرمانەکانی خواوەند زیوس نەکەن، بەڵام زیوسی بەهێز هەرچی

خواستبا جێبەجێ دەکرا و بە زەبریی هێزی خۆی، هەموو لایەکی ناچاردەکرد گوێ لەمشتی بن، خواستی زیوس بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا جێبەجێ دەکرا زۆرکات بێ چەند و چوون، واتە زۆرکات زیوس هەڕەمەکی شتێکی دەگوت و لۆژیکی تێدانەبوو، بەڵام دەبوو جێبەجێ کرابا بەهەرشیوەیەک لەشێوەکان بوبێت، ئەو کارە بێ بنەمایانەی زیوس دەیکردن زۆر جار نیشاندەری ئەوەبوو کەزیوس شایەنی ئەوە نییە پاشای پاشایان و بەهێزی بەهێزان و خوای خواکان بێت. عەشق بازییە فرەو فراوانەکانی زیوس لەگەڵ ئافرەتە جوانەکاندا لەئاسمان و زەوی، خوخدەیەکەی هەمیشەی زیوس بوو.

لە پێشتردا زیوس خواوەندی ڕوناکی و ئاسمان بوو، بەڵام لەدوایدا بووبە خودای خوداکان و سەرداری هەمولایەک، بووە خاوەنی هێز و بڕیاری ڕەها و دەیتوانی هەموو شتێکی گوێ لێبێت و هەموو شتیک ببینێت و بزانێت و بڕیار لەسەر هەرچیەک بیەوێت بیدات، هیچ شتێ لەئەو شاراوە نەبوو، هیچ شتێکیش نەیدەتوانی ناکۆک بێ لەگەڵ خواست و ویستەکانیدا، هەرچییەک پێچەوانەی ویستی ئەو بوبا(تەنانەت ویستە بێ ماناکانیشی) ئەوا بەشێوەیەک تورە دەبوو کە ئاسمانی دەخستە لەرزە، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش شایەنی باسە کە بگوترێ زیوس بە گشتی خواوەندێکی عاقڵ و میهرەبان بوو، هەرچییەک بەباش و خراپ کە فەرمانی لەسەر دەدا، لەپێشتردا ڕاوێژی دەکرد لەگەڵ خۆی یان خواوەند و نیمچە خواوەندەکانی تری بانگێشت دەکرد بۆ تاوتوێ کردنی فەرمان و خواستەکەی، وە زۆربەی کارەکانی بە یاسا ئۆرجیناڵ و بنچینەییەکانەوە بەراورد دەکرد کەپەیوەندیدار بوون بەچارەنوسی هەموو شتێکەوە، ئەم ڕاوێژ و تاوتوێیانەشی بۆیە دەکرد تا سیستمی ڕەسەنی (بوونی/وجوودی) تێک و پێک نەچێت.

زیوس لەتوانایدا بوو کە؛ چاکە و خراپە، نەخۆشی و لەشساغی، شادمانی و غەمباری بەمرۆڤەکان ببەخشێت، وە زۆر کات سەرپێچیکارانی لەزەوی و ئاسمان سزادەدا چوون خودای خوداکانە و دڵێکی باشی هەیە لەگەڵ پاک ڕەفتاران و چاکەخوازاندا و سەرپێچیکارانیش سزا دەدات، وە زۆرکات زیوس خواستی وابووە کە بەخشندە و دلۆڤان بێت نەک سزادەر و تۆڵەسێن، بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە زۆرکات زیوس بڕیاری لەسەر شتێک دەدا، بەڵام لەدواتردا پەشیمان دەبوویەوە لەو شتە یاخود سزاکەی سووک دەکرد، بێ دەرامەتان و لێقەوماوانی زوو و سەردەمی پەرستشی زیوس هەمووان دەستیان بۆ ئەو بەرزدەکردەوە و لەو دەپاڕانەوە تا ناخۆشی و گیروگرفتەکانیان لەسەر ئاسان ببێت، وەزیوسیش یۆنانییەکان بەخواوەندی پارێزگاری یۆنانیان دەدا لەقەڵەم و دەیان گوت؛ هەموو یۆنان لەژێر چاودێری ئەودایە.

زیوس بەو دەسەلات و هێزەی خۆیەوە کە هەی بوو، هەموو (بوون) لەژێر فەرمانی ئەودا بوو، وە هەموو شتێکی خۆش دەویست، بەلام؛ بەلام لەهەموو هەبووەکاندا(بوونەکان و ئەوەی بوونی هەیە) زیاتر عاشق و شەیدای ژنان بوو، ژیانی ئیلاهیانەی زیوس زۆر تێکەلاوی سەرگوزەشتەی عەشقبازی و جووت بوون و ...هتد بوو ، بەلام هەموو ئەم حەزانەی زیوس بۆ ئافرەتان و پەیوەندی لەگەڵ مێینەکاندا و تێکەڵ بوونیان یاسایی و ڕێپێدراو نەبوو، ئەتوانین بلێین نیواو نیو بوو؛ نیوەی پەیوەندییەکان یاسایی و ڕێپێدراو و نیوەکەی تریشی نایاسایی و نیوەکەی تریشی نایاسای و ڕێپێنەدراو، هاوسەری گێتی و هەمیشەی زیوس ناوی (هێرا) یوو، جگە هێرا هەموو ئەوانەی تر کە زیوس لەگەڵیان تێکەڵ بوو گۆڕان و زیوس لێیان دوورکەوتەوە.[11]

[11]کتێبی (ئەفسانەی خواکان/ نوسینی شوجاعەلدین شیفا/لاپەڕە 5 تا 9)

# (هێرا)



بەیۆنانی:Ήρα

بەئینگلیزی:Hera

**هێرا**، خوابانوی ئاسمانە لە ئەفسانەکانی یۆناندا، کچی واوەند کرۆنوس  خوابانو ڕیئایە، خوشکی زیوسە و لەهەمانکاتیشدا هاوسەریەتی، (ئارس و هیبە و هیفایستۆس) منداڵانی ئەون، هێرا خوابانویەکی حەسودبووە و دڵیشی پیس بووە لە زیوس، زۆرکات مەعشوقەکانی زیوسی لە ئەرز و ئاسمان ئەشکەنجە ئەیا و زۆر لەگەڵیان سەختگیر و توند بوو.[12]

ئۆڵۆمپ؛ مەنزڵگای خواوەندانی نەمر، پادشا و فەرمانڕەوایی ئەم شوێنە زیوس بوو، زیوس هاوسەرێکی هەبوو کە هاوپشکی بوو لەهێز و توانادا " ئەڵبەتە لەسایەی تەختەکەی زیوسەوە" بەناوی (هێرا)، ڕۆمیەکان (هێرا)یان بە (یۆنون) ناودەبرد، هێرا یەکێکە لەخوابانوە بەهێزەکان

[12]کتێبی(الهه و ایزدان/ به کوشش امیر بهنام/ص115)

لەڕووی ئەفسانەییەوە و وەبە خوابانوی ئافرەتان ناسێنراوە، چارەنوسی ئافرەتان هەر لەسەرەتای بوونیانەوە تا کۆتایی لەدەست ئەو دا بوو، وەلەدوایدا سێ پەرستگای جیاوازیان(لەڕووی مەبەستەوە) بۆ خوابانو هێرا دروست کرد، پەرستگایەک بۆ ڕۆژگاری کچێنی ئەو، وەپەرستگایەکیش بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە ژنێکی جوان و مێردار بوو، پەرستگایەکیش بۆ ڕۆژگارێک کە هێرا بێوەژن بووە و لەهەمانکاتیشدا سەرپەرشتی بێوەژنانی لە ئەستۆ بووە.

هێرا وەک خوابانوی ژن و مێردایەتی و دایکایەتیش پەرستش دەکرا، هەمیشە هێرا وەک ژنێکی ژیر و وەفادار هەژماردەکرا، ئەم خوابانوە هەمیشە لەسەر شێوەی ژنێکی دەموچاو باڵا جوان و کەسایەتیەکی سەختگیر دەردەکەوت و زوو هەست دەکرا ئەو ژنە مێردی هەیە و نابێ کەس بەچاوی تەماعەوە تێی بڕوانێت، هەر ئەمەش وای کردبوو لە هێرا، کە پێی ناخۆش بێت هیچ ئافرەتێک لە هاوسەرەکەی نزیک ببێتەوە، بەردەوام تاجێکی لەسەر بوو وە جل و بەرگێکی شۆڕی لەبەردابوو، کۆچانێکی لە گەوهەر چێ کراوی لەدەست بوو کە وێنەی کۆترێکی لەسەر بوو لەدەستەکەی تریشیدا هەنارێکی پێ بوو کە ئەمەیان لەلای یۆنانییەکان بە سیمبولی عەشق و ژن و مێردایەتی و خۆشەویستی دادەنرا.

# (پۆزیدیون)



بەیۆنانی:**Ποσειδώνας**

بەئینگلیزی:**Poseidon**

**پۆزیدیۆن**، خواوەندی زۆر شت بوو، وەک تاشەکان ، ئەسپەکان و..هتد، دەسەڵاتێکی زۆری بەرکەوتبوو لەقورعەکێشیەکەی میراتی ئاسمانی دوای نابووت کردنی کرۆنوسی باوک بەدەست زیوسی کوڕ، بەڵام ئەوەی زیاتر پۆزیدیۆنی پێ ناسرابوو خواوەندایەتی زەریا و دەریا و ڕووبارەکان بوو، ئەم خواوەندە کوڕی خواوەند کرۆنوس و خوابانو ڕیئا بوو، هاوسەرگەلی بێ شوماری هەبوو، هەر لەپەرییە دەریایەکان و کەسایەتییە ئاسمانایەکانەوە بیگرە تا نیمچە خواوەند و مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەویش کە خوێنیان ئاسمان زادە و خواوەند زادە بوایە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش ئەتوانین بڵێن پۆزیدیۆن نەوەکانیشی لەژمارە نایەن.

پۆزیدیۆن برای زیوس و هادیس بوو، ڕمێکی سێ سەری ئەهریمەن ئاسای لەدەستا بوو،

دۆلفینیشی وەک سواری بەکاردەهێنا هەندێ جار و زۆرکاتیش لەسەر گالیسکەیەک بەبان دەریا و زەریاکاندا دەهات و دەچوو کە چەند ئەسپێکی نیوە ئەسپ و نیوە ماسی ڕایان دەکێشا، ئەو دەسەڵاتی هەستاندن و جوڵاندن و شەپۆلی بچوک و گەورە و ترسناکی بەسەر دەریاکاندا هەبوو لەهەمان کاتیشدا دەسەڵاتی هێور کردنەوەی هەبوو هەرکات بیویستبا.

یەکێ لەهاوسەرە دیارەکانی پۆزیدیۆن (ئامفرتیت)ە، ئامفرتیتیش خۆی یەکێ بوو لەپەرییەدەریاییەکان و کچی پاشایەکی تری دەریا بوو بەناوی (ناروس) ، بەڵام باوکی ئامفرتیت (واتە ناروس) هێندەی پۆزیدیون دەسەڵاتی نەبوو، دوای ئەوەی هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئامفرتیت، منداڵ گەلی زۆریان بوو، جوان و ناشرین و جۆراو جۆر و سەیر، بۆنمونە منداڵیان دەبوو نیوەی مرۆڤ بوو نیوەی ماسی بوو، دیارترینی ئەم شێوەیە لەمنداڵ (تریتۆن)ی نیوە مرۆڤی نیوەماسی بوو، ئەم تریتۆنە هاوڕێیەتیەکی زۆری هەبوو لەگەڵ دۆلفینەکاندا، وە زۆر حەزی بە سواربوونی پشتی دۆلفینەکان ئەکرد، دوای ئەمە شێوە منداڵگەلێکی تریان هەبوو کە بە(مدیوسا یان مەدیۆسا)کان بەناوبانگن، ئەم شێوەیە زۆر ترسناک بوون، لەبری تاڵی قژ بەسەریانەوە مارگەلی زۆری پێوە بوو، کە هەمیشە دەجوڵانەوە و فسە فسیان دەهات، ئەم مەدیوسایانە بەسەیرکردنی هەرشتێک بەرقەوە ئەو شتەیان ئەکردە بەرد و وشکیان ئەکرد، ئیتر ئەژدیهایەکی زەبەلاحی دەریا بوایە یان مرۆڤێک فەرقی نەدەکرد، هێزیان بەڕادەیەکی واهەبوو ، کەدەیان توانی تەنها بەسەیرکردنێک ئەژدیهایەک یان بونەوەرێکت بۆ بکەنە بت و خاشە سەنگ.

# (هادیس)



بەیۆنانی:Ἅδης

بەئینگلیزی:Hades

**هادیس** فەرمانڕەوای مردوان و دنیای ژێرزەمینییە، کوڕی کرۆنوس و ڕیئایە، برای زیوس و پۆزیدیونە، جا ئەم لەکاتی قورعە کێشیەکەی ئاسماندا، خراپترین بەشی بەرکەوت کە فەرمانڕەوایەتی بکات، ئەویش فەرمانڕەوای دنیای مردووان و دنیای ژێزەمینی پڕ لە ئاگر و ئاسن و تاریکییە، هەر بۆمەعلومات هادیس خودای (مەرگ نییە) بەڵکو خودای دوای مەرگە و کاری بەدوای مەرگی مرۆڤەکانەوە هەیە، خودای مەرگ لە ئەفسانەکانی یۆناندا(تاناتۆسـ)ـە.

خەشم و قین و توڕەی و ڕەشبینی و ڕق خەسڵەتە دیارەکانی هادیس بوون، جا سەگێکی گەورەی سێ سەری ترسناکی هەبوو، ئەم سەگانە سیمبولی بەحساب بۆ ئەوە بوون کە پاسی مردووانیان پێ بکات، ئەم سەگانەشی هەم بۆ مەبەستی ترساندنی مردوان بەکار دەهێنا و هەم زۆرجار بۆ

مەبەستی پاسەوانی کردنی مردووەکانیش بەکاری دەهێنا لەدنیایی ژێر زەمیندا.

ڕۆحی مردوان کەبۆ ژێرزەمین دەڕۆشتن، تا هادیس ڕەزامەندی دەرنەبڕیایە، نەیان دەتوانی بچن، جا شوێنی چاوەڕوانی کردنی مردووان تا داخلی دنیای ژێرەوە دەبوون لەناوی خراپتر ناوی لەدەری خراپتر، هادیس هەر ڕێی پێ دەدان کە بچنە ژووری بەڵام بۆ هەر بۆ عەزاب لەوێشدا زۆرکات دەیهێلانەوە، بەڵام هەرکەس بچوایەتە ئەو ژێرە ئیتر هاتنە دەرەوەی نەبوو، هەتا هتایە لەوێ دەمایەوە، هەرچەندە هەندێ کەسایەتی ناو ئەفسانەکان هەن کە توانیویانە "جابەڕەزامەندی هادیس بێت یان بەهەڵهاتن" لەو ژێرە بێنە دەرەوە وەک ( هێرکول و سیزیف و ئۆرفیۆس و...هتد).

# (دیمیتێر)



بەیۆنانی:Δήμητρα

بەئینگلیزی: Demeter

**دیمیتێر**، لەئەفسانەکانی یۆناندا، یەکێکە لە خوابانوانی ئۆلۆمپ و خوابانوی بەرەکەت خستنە بەروبووم و بەبرشتییە، دیمیتێر کچی کرۆنوس و ڕیئایە، بوە هاوسەری برای خۆی واتە خواوەند زیوس و لە زیوس (پریسفۆنـ)ی هێنایە بوون.

# (هیستیا)




(هیستیا)

بەیۆنانی:Εστία

بەئینگلیزی:Hestia

**هیستیا**، لەئەفسانەکانی یۆناندا، خوابانویەکی کەنیشک(باکیرە)یە، وە خوابانوی جەم بوونی خێزانەکانە بەسەلامەت، و خوابانوی کوانو ئاگردانە ، کچی کرۆنوس و ڕیئایە، گەورەترین خوشکی زیوسە، یۆنانیانی کۆن، لەتەواوی بۆنە و ڕێوڕەسم و کۆبوونەوە خێزانی و دۆستایەتیەکانیاندا قوربانیان بۆ ئەم خوابانوە ئەکرد، هاوێنەی هیستیا لە ئەفسانەکانی ڕۆمدا، (ڤیستا)یە، کە ڕۆمەکان لە کۆندا بەهەمان مەبەست دەیان پەرست و قوربانیان بۆ ئەکرد.

هیستیا یەکێکە لەخوابانوانی ئۆڵۆمپ نشین، زۆرکات هیستیا دەخرایە ژێر فشار لەلایەن پۆزیدیۆن و ئەپۆلۆوە تا ببێتە موڵکیان، بەڵام هیستیای کەنیش بەسەری زیوس سوێندی خواردبوو کەتاهەتایە باکیرەی خۆی بپارێزێ.

# (هیفایستوس)



بەیۆنانی:Ήφαιστος
بەئینگلیزی:Hephaestus

**هیفایستوس** نیمچە خواوەندی پیشەوەران و چاودێری وەستایان و ئاسنگەران و دارتاشان بووە، کوڕی خواوەند زیوس و خوابانو هیرایە، لەبەر ئەوەی بەرگری لەدایکی کردووە لەپێش زیوسدا، زیوس فڕێی دەداتە سەرزەوی کەبەر زەوی ئەکەوێ قاچێکی ئەشکێ و لەنگ ئەبێ بۆهەمیشە، وەڕیوایەتێکی تر هەیە ئەڵێ هەر بشەلی و نوقستانی هاتۆتە بوون و لەبەر ئەم کەم ئەندامیەشی زیوس لەئاسمانی بێ کەموکوڕی دەری دەکات، بەهەرحاڵێک بێت لە ئاسمان نەژیا و لە دورگەی(لیمنوس) ژیا لەسەر زەوی، بووە سەنعەتکار ، هاو وێنەی ئەم نەگبەتە لە ئەفسانەکانی ڕۆمدا (ڤۆلکانوسـ)ـە.

# (ئارس)



بەیۆنانی:Άρης

بەئینگلیزی:Ares

**ئارس** لەئەفسانەکانی یۆناندا بەخواوەندی جەنگ و تێکۆشان دادەنرێ، مانای ناوەکەشی واتە (کۆشش کردن لەنەبەردیـ)دا، ئارس کوڕی خواوەند زیوس و خوابانو هیرایە، برای "هیفایستۆس و هیبا و ئاریس و ئایلۆتۆیا"یە، ئارس بۆ خۆشی باوکی "ئارۆس و هارمۆنیا و هیپۆلیتا و فۆبوس و دیمۆسـ"ـە.

لەئەفسانەکانی ڕۆمدا، ئارسی خواوەند، بە(مارس) ناودەبرێ، یان بەشێوەیەکی تر بیڵێم لە ئەفسانەکانی ڕۆمدا مارس هەمان ئیش و کارەکانی ئارسی هەیە و بەهەمان مەبەستی ئارس پەرستش دەکرا.

# (ئاسینا)



بەیۆنانی:Αθηνά

بەئینگلیزی:Athena

**ئەتینا** لەئەفسانەکانی یۆناندا، خوابانوی پاسەوانی و حیکمەت و ستراتیجیەتە ، خوابانوی شاروشارنشینیی و کاری دەستکرد و پیشەسازی و کشتوکاڵە، خوابانویەکی باکیرە(پاکیزە)یە، کچی زیوس و میتیسە. کە دواتر ڕۆمییەکان ناوی ئاسینایان نا بە (مینروا).

ئاسینا یەکێکە لەخوابانوە گەورە و بەدەسەڵاتەکان لە ئەفسانەکانی یۆناندا، ئاسینا بەخوابانوی ژیری و هۆشیش دانراوە، پلەو پایەی ئەم خواوەندە لەئەسینادا کە شارێکی یۆنانە، زۆرتر بووە لە هەموو شوێنێک، چوون خەڵکی ئەسینا ئەم خوابانوەیان بە؛ پارێزەری شارەکەی خۆیان زانیوە.

لەدایک بوونی ئاسینا:

ئاسینا کچی خوای خواکان زیوس بووە، دایکی ئەم خوابانوە ناوی خوابانو میتیسە هەروەک لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، میتیسیش بەعەقڵ فراوانی و بیرتیژ ناسرابوو، دوو خواوەند هاتنە لای زیوس و پێیان گوت: لەوانەیە ئەو وەچەیەی لەم ژنە دەی هێنیتە بوون زۆر ژیر بێت، وە بەشێوەیەک بەهێز و فکرفراوان و بەستراتیجیەت بێ لە بیرکردنەوەدا، کە تەختی پاشایەتی لەژێر زیوس دەربهێنێت، بۆیە زیوس ترسا و میتیسی بە کۆرپەکەی ناوسکیەوە قوت دا، دوای قوتدانی ئەم دوانە زیوس سەرئێشەیەکی توند بۆ ماوەی 9شەو 9 ڕۆژ لێی دا و بەو هەمووە هێز و پلەیەی کە هەی بوو نەی توانی ئەو ئێشە چارەسەر بکات، لەو کاتەدا( هیسفایستوس)[13] هات و تەورێکی لەسەری زیوس دا و قلیشاندی و لەو قڵیشاویەوە ئاسینای جوان هاتە دەرێ و هاواری سەرکەوتنی کرد.[14]

[13] خواوەندی پیشەسازی و پیشەوەران.

[14] کتێبی ( ئەفسانەی خواکان/ شوجاعەلدین شیفا/لاپەڕە 82و83)

# (ئەپۆلۆ)



بەیۆنانی:Απόλλων

بەئینگلیزی:Apollo

**ئەپۆلۆ** لە ئەفسانەکانی یۆناندا، خواوەندی ئاواز و مۆسیقایە، خواوەندی تیروکەوانبازی و ڕمبازییە، بەڵام ئەم ڕم و کەوانەی بۆ جەنگ و شکار زۆر بەکار نایەت، بەڵکو هەروەک ڕەمزێکە لە نێو مستیدا، دوای ئەوانەش خواوەندی هونەرەکانە بەگشتی و خواوەندی پێشگۆییەکانە.

ئەپۆلۆ کوڕی (زیوسـ)ی خواوەند و (لیتۆ)ی خوابانوە، وەبرای دووقلوی ئارتمیسە، زادگای لە ئەفسانەکاندا دورگەی (دیلۆسـ)ە، ئەپۆلۆ لە(دێلفی)پەرستگایەکی هەبوو، کە یۆنانییە کۆنەکان، پێشبینییەکانی ئەویان بە پیرۆز و ڕەوان و دروست لەقەڵەم ئەدا تێیدا، دەگێڕنەوە ئەپۆلۆ ئەژدیهایەکی بەناوی(پیتۆن)کوشتووە لەو جێگایەی کە ئەو نەبەردیەی تێدا ئەنجام داوە(کە کێوی هێلیکونـ)ە، لەگەڵ کچانی زیوس و تیمیس و خوابانوانی هونەرەکان کەهاوڕێی و کەسو کاری

بوون ئاکنجی بوو. ئەپۆلۆن باوکی (ئاسکلیپیوس/خواوەندی پزیشکی)بوو، وە ئاسکلیپیوسیش پارێزەری شاری(تەروئادا/تەروادا)بوو.

لەوانەیە دوای خوابانو و خواوەندان (زیوس و ئارس و ئافرۆدیتە)، ئەپۆلۆ بەناوبانگترین خواوەند بێت، ئەپۆلۆ هەر لەسەرەتاوە بووە خواوەندی ئەدەب و هونەر و زۆر شتی تر و بوبە قارەمانی ناو داستانەکانە ئەفسانەییەکان، ئەپۆلۆن یەکێکە لەوخواوەندانەی کە هونەرمەندان و شاعیران و نوسەرانی کۆن و نوێ زۆرترین کات باسیان کردووە و پێیاندا هەڵداوە.

هەندێ ئەفسانەنوس وای بۆ دەچن کە ئەپۆلۆ خواوەندیکی ئاسیاییە و لە ئاسیاوە گواستراوەتەوە و دزەی پێ کراوە بۆ یۆنان، وە هەندێکیش ئەوە ڕەتدەکەنەوە و دەڵێن؛ ئەپۆلۆن خواوەندێکە کە لەئەوروپاوە بازرگانان و ئاوێنە پەرستان هێنابێتیانە یۆنان، بەهەر شیوەیەک بووبێت ئەپۆلۆ خواوەندێکی یۆنانی نییە، لەوانەیە خواوەندێکی ئاریایش نەبێت، بەڵام یۆنانییەکان ئەوەندە باسیان کردووە و خزمەتیان کردووە و داتاشراو داستان و وێنەیان لەسەر کێشاوە و نوسیوە و هۆنیوەتەوە کە بۆتە ڕەسەنترین خواوەندی ئۆلۆمپی.

# (ئارتمیس)



بەیۆنانی: Ἄρτεμις

بەئینگلیزی:Artemis

**ئارتمیس** لەئەفسانەکانی یۆناندا، خوابانوی ڕاو و شکارە، خوابانوی مانگ و مرازحاسڵییە، کچی خوابانو(لیتۆ)و خواوەند (زیوسـ)ـە، خوشکی ئەپۆلۆیە(واتە لە جمکانەکەیە)، ئارتمیس یەکێکە لە خوابانوە پاکیزەکانی ئۆڵۆمپ، ئەو بە تیرو کەوانەکەی کە لەلایەن (هێفائیستوس)و(سیکلوپەکان/غولە یەک چاوەکان)وە دروست کرابوو ئامادە و تەیارکرابوو، بەپێی ڕیوایەتی ئەفسانەکان ئارتمیس یەک ڕۆژپێش ئەپۆلۆ ، لەدورگەی (ئارتیجیا)هاتۆتەبوون،دوای لەدایک بوونی فەوری یارمەتی دایکی دا بۆ ئەوەی لە تەنگەی دیلۆس کە ئەپۆلۆی لێ لەدایک بوو، کۆمەک پێشکەش بکات.

پەرستگای ئارتمیس ئێستا یەکێکە لە حەوت سەرسوڕهێنەرەکەی جیهان و ئێستا ئەکەوێتە تورکیاوە.[15]

[15] کتێبی ( الهەها و ایزدان/بە کوشش: امیر بهنام/ص 105)

ئارتمیس یەکێکە لەوخوابانوانەی کە هەر لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، بۆتە جێگای سەرنجی هونەرمەندان و نوسەران، زۆرترین شیعر بۆ ەم خوابانووە نوسراوە، یان ئەم خوابانوە تێکەڵ بەشیعر و پەخشانەکانی کۆن و نوێ کراوە، زۆرترین پەیکەر و داتاشراو و زۆرترین تابلۆ بۆ ئەم خوابانوە داتاشراوە و نەخشێنراوە، سەرەڕایی هەموو ئەمانە، ئەم خوابانوە شۆخە لە کەسایەتی و بەسەرهاتەکانیدا کەلەسەری گێڕدراوەتەوە و نوسراوە، هیچ نیشانەیەکی سۆز و هەستی باش نییە کە ئومێدێک بداتە دڵی عاشقانی، هەمیشە وەک نێرەیەک کە بچێت بۆ شکار ، جووتێک کەوشی ڕاوی لە پێدا بوو، قۆڵ و قاچی هەمیشە ڕووت بوو، چەند سەگێکی هەبوو لەگەڵی خۆی دەیبردنە ڕاو کردن، هەرچەندە جوان و شەپاڵ بوو بەڵام جگە لە ڕاو شکار کاری بەهیچ شتێکی تر نەبوو، نەعەشق و عەشق بازی نە خۆشل کردن بۆ هیچ نێرەیەکی زەوی و ئاسمانی.[16]

[16]کتێبی( ئەفسانەی خواکان/ شوجاعەدین شیفا/لاپەڕە 91 تا94)

# (ئافرۆدیت)



بەیۆنانی:Αφροδίτη

بەئینگلیزی:Aphrodite

**ئافرۆدیت** لەئەفسانەکانی یۆناندا، خوابانوی عەشق و خۆشەویستییە، هاوتا و هاو وێنەی ئافرۆدیت لەئەفسانەکانی ڕۆمدا "خوابانو ڤینۆس"ە، ئافرۆدیت کچی خواوەند زیوس و خوابانو دیۆن ە، یەکێکە لەخواوەندانی ئۆڵۆمپ و جگە لەخوابانویەتی کردنی عیشق بە خوابانوی جۆش و خرۆشی جەستەیش دادەنرێ، هەندێ ڕیوایەت هەیە ئەڵێن ئافرۆدیت لە کەفی دەریا کاتێ گونی کرۆنۆسیان بری و فڕییان دایە دەریاوە ئافراوە، بەڵام زۆر باوەڕپێکراو نییە ئەو ڕایە.

ئافرۆدیت ڕاستە هاوسەری "هیفایستۆس"بوو، بەڵام پەیوەندیگەلی زۆر و زەوەندەی لەگەڵ خوادایان و نیمچە خودایان و کەسایەتییە ئەرزیەکاندا هەبووە، وە لەهەرکام لەو پەیوەندیانەشدا بەسەلامەت دەرنەئەچوو و ئیلا منداڵی دەخستەوە، ئافرۆدیت زۆر خواوەند و کەسایەتی حەزیان لێی بوو وە عاشقی بوون هەم لەسەر زەوی و هەم لە ئاسمان، واتە لە سەرزەوی و لەناو مرۆڤەکانیشدا ماشوقەی هەبوو ، یەکێ لە دیارترین ماشوقەکانی لەسەر زەوی کەسایەتیەکە بەناوی "ئادینیس"، ڕیوایەتێک هەیە ئەڵێ "هیلین" ئەو کچەی بە بیانویەوە شەڕەکەی

(تەروادە/ترۆی)هەستا نەوەی ئافرۆدیتە.[17]
گوزەرانی ئەو خوابانوەی کە هەموو عەشقبازییەکانی جیهان لەژێر فرمانی ئەودا بوو، بێ شک خۆی نەیدەتوانی بێ ئەو عەشقبازی و ئەیش و نۆشە بسەرویێت، جوانی و شەپاڵی ئافرۆدیت بەشێوەیەک بوو کە هیچ خواوەند و نیمچە خواوەند و ئادەمیزادێک نەی دەتوانی لەبەردەمیدا خۆی رابگرێت، جا ئافرۆدیت جیاواز لە زۆربەی خوابانوەکانی تر کە پاکیزە و یەک هاوسەر بوون، بێ دڵی خۆی و ئەوانەشی نەدەکرد کە حەزیان لێ دەکرد، بەسەرهاتی عەشق بازیەکانی ئافرۆدیت زۆرن، بەڵام بەشێکی کەمی باس دەکەم کە بۆتە هۆی بەخشینی ئیلهام بەشاعیران و نوسەرانی کۆن و نوێ تا شاکارەکانیانی پێ بنوسن، خواوەندانی ئۆلۆمپ بەگشتی سەرمەست و عاشقی ڤینۆس بوون، بەڵام سەرئەنجام لەناو ئەو هەمووە خواوەند و نیمچە خواوەندە قۆز و چوارشانانەدا ، ئافرۆدیت بەنسیبی ناشرینترین و داماو ترین خواوەند بوو.
ئافرۆدیت بووە نسیبی (هیفایسوس)ی شەل و گێڕ، کە سەرەڕای شەل و گێڕیەکەشی سیمایەکی ناجوان و نادڵگیری هەبوو، خواوەند زیوس وای بەباش دەزانی ئافرۆدیتی جوانخاس بدات بە ئەو، چوون زیوس پێی وابوو؛ ئەم مێردە ناشرینە بەباشی قەدری ئافرۆدیت دەگرێت و لەهەموو رویەکەوە رازیدەکات، بەڵام ئافرۆدیت کە هەمیشە خواوەندان و نیمچە خواوەندانی چواردەوری بە چاوی هەوەسەوە سەیریان دەکرد و مێردە ناشرینەکەشی هەمیشە لەسەفەردا بوو، نەیدەتوانی تەنها بەو بەشەی"واتە هیفایستوسی مێردی" دەست لە جووت بوون و عەشقبازیەکانی خۆی هەڵبگرێت، بۆیە هەر زوو لەگەڵ چەندەها خواوەند و نیمچەخواوەندی گەنج و قۆزدا، توشی تێکەڵی و وەچەخستنەوە و عەشق بازی بوەوە، یەکێ لەخواوەندە دیارەکان کە ئافرۆدیت لەگەڵیدا تێکەڵ و جووت بوو، (ئارس)ی خواوەندی جەنگ بوو.
دواتر ئافرۆدیت لەگەڵ هێرمس و ...چەندین کەسایەتی و خواوەندی تر دەستی تێکەڵ کرد.[18]

---

[17] کتێبی( الههها و ایزدان/به کوشش: امیر بهنام/ص110)
[18] کتێبی( افسانه خدایان/شجاعدین شفا/ص 70-75)

# (دیۆنیسۆس)



بەیۆنانی:Διόνυσος

بەئینگلیزی:Dionysus

**دیۆنیسوس** خواوەندی شەراب و سەرگەرمی و کشتوکاڵە لەئەفسانەکانی یۆناندا، کوڕی خواوەند زیۆس و خوابانو سیملە یە، وە ڕۆمەکانیش هاوشێوەی دینیسۆسیان هەیە کە هەمان کاری دیۆنیسۆسی هەیە بەڵام بەناوی (باکخۆس).

# (هێرمس)



بەیۆنانی:Ερμής

بەئینگلیزی:Hermes

**هێرمس** پەیامهێنەری خواوەندانە لەئەفسانەکانی یۆناندا، لەئەسڵا خواوەندی شەپیوری جەنگە، بەڵام بەخواوەندی بازرگانی و بازرگانان و ئەندازە و وەزن و ئەدەبیات و وەرزشەکانیش دێتە هەژمار، کوڕی خواوەند زیوس و خوابانو مایایە، هاوسەری پەریەکی دەریایی بوو، پان و ئاروس منداڵانی هێرمسن، پان خواوەندی (نەی و فلوت بوو).

هێرمس هەندێ جار بەخواوەندی دزیشی دادەنێن!

چوون لەمنداڵیدا وڵاخی ئەپۆلۆی دزی و وڵاخەکەی کوشت، ڕیخۆڵای وڵاخەکەی بەکارهێنا لەدروستکردنی ئامێرێکی مۆسیقیدا(کەهەندێ لە ئەفسانە ناسان ئەڵێن ئامێرێکی حەوت وەتەری بووە و لەشێوەی کەماندا بووە و هەندێکی تریش ئەڵێن پێنج وەتەری بووە)، جا خۆلاسە ئەپۆلۆش

بەنەمانی وڵاخەکەی زۆر تورە بوو، دواتر کەزانی ئیشی هێرمس بووە چووە تەڵەوی، لەکاتی چونە سەری هێرمسدا، ئەپۆلۆ گوێی لە ئاوازێک دەبیت بەدەست و پەنجەی هێرمس، دواتر هێرمس بۆی ڕوون کردەوە کە بۆ ئەو شتە وڵاخەکەی کوشتووە ئەپۆلۆ ڕقەکەی نەما و هیور بوویەوە چوون زۆر حەزی بەدەنگەکە کرد، بۆیە بڕیاری دا لە هێرمس خۆش بێت، بەس هەروا بەبەلاش نا ، بەڵکو لە بەرامبەر وڵاخەکەیدا ئامێرە مۆسیقییەکەی برد.

# (ئاربوس)



بەیۆنانی:Έρεβος

بەئینگلیزی:Erebus

ئەوەنەی نوسراوە و ئاشکرا کراوە لەسەر ئەم کەسایەتییە لە ئەفسانەکانی یۆناندا، ئەوەیە کە خوشکێکی خۆی مارە کردووە بەناوی(نوکس/شەو)، و وە سێ منداڵی هەیە بەناوەکانی:

- ئاتێر/فەزا
- هیمرا/ ڕۆژ
- خارۆن

بەڵام ڕیوایەتێکی تر هەیە ئەڵێ:

ئاربوس ئەوەنەی ئیشارەت کردنە بەتاریکترین بەشی جیهانی ژێرزەمینی هادیس، ئەوەندە کەسایەتیەک یان خوداوەندێک یان نیمچە خواوەندێک نییە.

# (ئەتڵەس)



بەیۆنانی:Ἄτλας

بەئینگلیزی:Atlas

**ئەتڵەس** یەکێکە لەلایەنگارانی تیتانەکان، کاتێ بەرەنگاری زیوس بوونەوە لەو شەڕەدا کە زیوس بەرپای کرد دژی کرونوس و تیتانەکان و تێیدا زیوس سەرکەوت، دوای ئەوە ئەتڵەس حوکم درا بەوەی تاقەرەی قیامەت، فەلەک لەبان پشتی هەڵگرێ و لەکۆڵی بگرێ.

ئەتڵەس هەر ناوەکەشی بەمانای(حەمل کەر/هەڵگر) دێت

ئەتڵەس مێردی پلیونە بوو لە پلیونەش ئەم منالآنەی هێنایە بوون:

- پلیادس
- هێسپریدس
- هوئادیس
- کالیسپۆ

# (ئاروس یان ئیرۆس)



بەیۆنانی:Έρως

بەئینگلیزی:Eros

**ئاروس** خواوەندی هەڵگرسانی عەشق و دامرکاندنەوەی عەشقە لە ئەفسانەکانی یۆناندا، کوڕی خارۆس ە، بەڵام ڕیوایەتێکی تر هەیە ئەڵێ کوڕی خوابانو ئافرۆدیت و خواوەند ئارس ە، ئاروس دوو تیر لەتیردانەکەیدایە، یەکێک لەتیرەکان لە ئاڵتوون و یەکێ تریان لە قورقوشم دروستکراوە، تیری  ئاڵتوونی بۆ ئەوە بەکارئەبرد کە عەشق لەمابەینی دوو شتدا هەڵگیرسێنێت، و تیری قورقوشمیشی بۆ ئەوە بەکاردەهێنا کە عەشق لەنێوان دووشتدا خامۆش کات، لە ئەفسانەکانی ڕۆمدا هاو وێنەی ئەم خواوەندە، (ئامور/خوای عەشقی ڕۆمیان) و خواوەند(کۆپیدو/خودای شەهوەت)ە.

تیری ئاروس بەنیگای ئافرۆدیتەوە پەیوەست بوو ، ئافرۆدیت سەیری هەرکەسی بکردبا و ئەو

کەسەی بخستبایە داوی عەشقی خۆی ئاروس بەتیرەکەی زیاتر دڵی ئەو کەسەی گیرۆدە و موشتاقی خوابانو ئافرۆدیت دەکرد.
ئافرۆدیت؛ ژمارەیەکی زۆر پەری و خواوەند و نیمچە خواوەندی گچکەی لە بەردەستدا بوو، بەناوبانگترینی ئەو پەری و خواوەندانە کەلەگەڵ ئافرۆدیت بوون؛ (ئاروس)بوو.
ئاروس بەتیر و کەوانەکەی خۆی چاودێری ئەوەی دەکرد داخوا ئافرۆدیت سەرنجی کێ دەدات و مەیل و ویستی لەکێیە بۆ ئەوەی ئەمیش بیکاتە ئامانجی تیرەکەی خۆی و دڵی ئەو کەسە زیاتر گرفتاری خوابانوی جوانی (ئافرۆدیت) بکات.
مەسەلەی ئەو دڵ و تیرەی ئێستاش کە زۆر کات نیشانەی خۆشەویستی و دڵبەستەیی کەسێک بە کەسێکی تر دەگەیەنێت هەر ئەم تیرەی ئاروس کە دەیهاوییە دڵی مرۆڤەکان کە بەردیەی دەکەوتن.[19]

[19]کتێبی ( ئەفسانەی خواکان/ شوجاعەدین شیفا/ لاپەڕە 81)

# (پریسفۆن)



بەیۆنانی:Περσεφόνη

بەئینگلیزی:Persephone

**پریسفۆن** لەئەفسانەکانی یۆناندا، شاژنی جوانخاسی جیهانی ژێرەوەیە، کچی خواوەند زیوس و خوابانو دیمیتێرە، ئەم خوابانوە ئافرتێکی جوان و بێ وێنە و لەبەر دڵان بوو، کە هەمووان لە ئەرزو ئاسمان خۆشیان لێی دەهات، وحەزیان لێی بوو، بۆنمونە یەکێ لەوانەی کە خۆشی دەویست وحەزی دەکرد ببێت بەموڵکی خۆی، هادیس بوو، ڕۆژێ پریسفۆن چوو بۆ گوڵ چنین، بۆدەشتی (ئیننا) لەناکاو وەک بەڵای ناگەهان زەوی شەقی برد و هادیس لەژێر زەویەکەوە هاتە دەر، پریسفۆنی لەبەردڵانی فڕاند و لەگەڵ خۆی بردی بۆ جیهانی ژێرەوە، هیچ کەسێکیش بەمەی نەزانی، زیوسی خودای خودایان و (هلیاس)ی خودای سپێتی و جوانی.

دوای دیارنەمانی پریسفۆن کچە جوانخاسەکەی دیمیتێر، خوابانو دیمیتێر بەدڵێکی شکاو بەخەفەتبارییەوە تاتوانی بەدوای کچەکەیدا گەڕا، بەڵام نەیدۆزیەوە، تا ئەو کاتەی هلیاس بۆ دیمیتێری گێڕایەوە چی قەوماوە، کە دیمیتێر بە ڕووداوی فڕاندنەکەی زانی بەیارمەتی هلیاس،

زۆرتر بێتاقەت و خەفەتباربوو، وە خۆی لە خەلوەت و تەنهایدا بۆ کچە نازدارەکەی کۆت و بەند کرد، و بەم خەڵوەت گرتنەی دیمیتێریش زەوی بەبرشتی خۆی لەدەست دا وتاقە گوڵێک و تاقە گیایەک لەزەویەوە سەری دەرنەهێنا ئیتر، ئیتر زیوس زانی ئیش واناڕوات و ڕەوتەکە بەرەو ئاڵۆزی ئەڕوات، هێرمس ی ناردە کن هادیس، دەستوری دا کەپریسفۆن ئازاد بکات، هادیسیش بەغەمباری و بەناچاری و بەنابەدڵیەکی زۆرەوە ملکەچی فەرمانی زیوس بوو، پریسفۆن یش کە زانی وەزعیکە ئاوایە، بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی، ووریاری دا، شەش مانگی هەموو ساڵێک لەلای هادیس لە ژێرزەمین بێت و شەشمانگەکەی تریش لای دیمیتێری دایکی بێت، بەم شێوەیە هەرکات پریسفۆن دەگەڕیتەوە لای دیمیتێری دایکی و دایکی لە خۆشحاڵیدا لەخەڵوەت دێتە دەرەوە گوڵ و گوڵزار و سەوزای لەسەر زەوی سەردەردێننەوە و کە کاتەکەش تەواو دەبیت و پریسفۆن دەگەڕیتەوە ژێرزەمین گوڵ و گوڵزار و سەوزایش نارۆیتەوە ، چوون هەرکات پریسفۆن دەرواتەوە بۆ ژێر زەمین دیمیتێریش(کەخواوەندی بەبرشتی زەوی و زاریشە) دەرواتەوە خەڵوەت، ئیتر لای روەکەکان و گیانلەبەرەکانیش دەنگی پێی پریسفۆن لەکاتی گەڕانەوەی بۆلای دایکی مانای هاتنی بەهارە و وەدەنگی پێی دووبارە کەلەلای دایکی دەڕواتەوە بەمانای هاتنی پایزە.

ڕۆمەکان پریسفوون بە Prosperinaناودەبەن.[20]

[20]کتێبی( الههها و ایزدان/ به کوشش: امیر بهنام/ص 122)

# (لیتۆ)



به یۆنانی:Λητώ

به ئینگلیزی:Leto

له ئەفسانەکانی یۆناندا به کچی تیتانی (فۆبه)[21] و (کیۆس)[22] ناوبراوه. ناوی لیتۆ بەمانای درەخشان و نهێنیش دێت.

گێڕانەوەکان دەڵێن؛ (هیرا)ی هاوسەری زیوس لەبەر ئەوەی که زیوس عاشقی لیتۆ بوو بوو، حەسودی به لیتۆ برد، کاتێ لیتۆ سکی له زیوس پڕ بوو ، بەفەرمانی هیرای هاوسەری زیوس ، هیچ زەویەک و هیچ جێگایەک لیتۆی قبوڵ نەکرد و لەخۆی نەگرت، سەرئەنجام زیوس دورگەیەکی له کەفی دەریا چێ کرد، تا لیتۆ و دوو نەوەکەی خۆی که له لیتۆ بوو[23] بپارێزێت.

لیتۆ لەسەرانسەری یۆنان و له باشووری خۆرئاوای ئاسیای بچووک؛ پەرستش دەکرا، له (دیلۆس)[24] و (ئاتین)[25]دا چەند پەرستشگا یەک هەیه که تایبەت بەخوابانو لیتۆ چێ کراون.

[21] لەوانەیه مەبەست له (فیۆبه) یەکێ لەم وشانه بێت :

- مانگ
- ئەفسانە(ئوستوره)

[22] کیۆسKoῖος یەکێکه له تیتانییەکان و باوکی لیتۆیه و هاوسەری فۆبەیه و باوەگەورەی ئەپۆلۆ و ئارتمیس و ئاستریایه.

[23] مەبەستی لەخواوەند(ئەپۆلۆ) و خواوەند( زیوس)ـه.

[24] دورگەیەکی سەر به یۆنانه.

[25] پایتەختی یۆنان.

# (مایا)



بە یۆنانی:Μαῖα

بە ئینگلیزی:Maia

**مایا**، یەکێکە لە خوابانوانی ئەفسانەی یۆنانی، یەکێکە لە حەوت کچەکەی خواوەند (ئەتڵەس) و خوابانو (پیلۆن)، لەناو کچەکاندا، مایا جوانترین و شۆخ وشەنگ ترین کەنیشک بوو. خوابانویەکی کەم ڕوو و شەرمن بوو، هەر لەبەر ئەمە بوو کە بەتەنها و بەبێ دەنگی، لەچیای (سایلین) لەناو ئەشکەوتێکدا ژیانی دەگوزەراند.

زیوسی خواوەند ئەم کچەشی دۆزیەوە و عاشقی بوو، وە هەموو شەوێک دەهاتە ئەو ئەشکەوتەی کەمایای لێ بوو، لەگەڵی عەشق بازی دەکرد و جووت دەبوو بەنهێنی ، تا (هێرا)ی هاوسەری بەم مەسەلەیە نەزانێت، لە ئەنجامدا مایا کوڕێکی لەزیوس هێنایە دونیاوە کە ئەو کوڕەش خواوەند (هێرمس) بوو.

# (ئۆکیانوس)



به یۆنانی:Ωκεανός

بەئینگلیزی:oceanus

**ئۆکیانوس** یان ئۆقیانوس، خواوەندی ئۆقیانوسەکان و کوڕی خواوەند (ئۆرانوس) و خوابانو(گایا)بوو؛ واتە لەتیتانییەکان بوو، لەگەڵ خوشکەکەی خۆی هاوسەرگیری کرد، خوشکەکەی ناوی (تیتوس)بوو، لەم خوشکەی خۆی بووە خاوەنی 3هەزار نەوە و منداڵ، ئەم منداڵانەش جۆراو جۆر بوون و زۆربەی ئەم منداڵانەی بوونە پەری دەریا و دەریچا و چۆم و ڕوبارەکان.

ئۆکیانوس لە شەڕی تیتانەکاندا، نەبووە هاودەست و لایەنگری تیتانەکان و توانی ڕەزامەندی زیوس لەدوایدا بەدەست بێنێت و لەئارامی و ئاسایشدا بەئاشتی ژیان بباتەسەر.

# (هێگیەیا)



بەیۆنانی:Υγεία

بەئینگلیزی:Hygieia

**هێگیەیا** یان هیگیئیا یان هایجیا، کچی ئاسکلیپۆسە، خواوەندی دڵدانەوە و سەلامەتی ئاوەرییە، ڕۆڵی زۆرگرنگی بینیوە لە ئاین و دینی ئاسکلیپۆس لەبارەی شیفابەخشییەوە، وە هەمیشە واناسراوە کە سەلامەتیهێنەر و شفاهێنەر و چارەسەرکەری زۆر دەردە و زۆرکاتیش هەر بەناوی(تەندروستی)ناوی دەهات.

خۆی و باوکی (واتە ئاسکلیپۆس) لەزۆر شوێنی ڕۆمانەکان و یۆنانیەکاندا دەپەرستران و زۆر ڕێز لێ گیراوبوون، بەزۆر بوونی دەسەڵاتی ئاینی ئاسکلیپۆس لەزەمانی ڕۆمەکاندا هێگیەیا بووە مانگ واتە مانگ لای ڕۆمەکان بووە ئەو و باوکیشی بووە خۆر و بوون بەو دوو کەسایەتییەی نێو ئەفسانەکان کە زۆرترین پەیڕەو شوێنکەوتەیان هەبوو، ناوی هێگیەیا تا ئەمڕۆش ماوەتەوە و چارەسەری(Hygiene)لەناوی ئەوەوە سەرچاوەی گرتووە، مارێکی پیرۆزی لەدەست بوو، کەخۆی لەعەساکەی باوکی ئەئاڵاند و زۆرکات هەرخۆشی وابەرجستە دەبوو، ئێستاش ئەو مارو دارەی هێگیەیا و ئاسکلیپۆس سیمبولی پزیشکی و تەندروستییە لەجیهان.

# (تیا)



به یۆنانی:Θεία

به ئینگلیزی:Theia

**تیا** یاخود ثییا، یەکێک بوو لەخوابانوە تیتانییەکان و خوابانوی بینایی و ڕوناکی و ڕەونەقی زەوی و ئاسمان بوو، ناوی (تیا) یان (ثیۆ/ثییا) بەتەنها بەمانای خواوەند دێت.

تیا لەگەڵ برای خۆی(هێپریون) هاوسەرگیری کرد و لە هێپریون بێ نەوەی خستەوە بەناوەکانی (هلیوس/ ڕوناکی) و سیلنا(مانگ) و (ئایوس/خۆرئاوابوون).

# (کیۆس)



بە یۆنانی:Κόιος

بە ئینگلیزی:Coeus

**کیوس** یان کێیوس، یەکێ بوو لە تیتانییەکان.

باوکی (لیتۆ) و هاوسەری ( فیۆبە) و باوەگەورەی ئەپۆلۆ و ئارتمیس و ئەستریا بوو، لەگەڵ جەمی تیتانییە دۆڕاوەکاندا ، دوای شەڕی زیوس و تیتانیەکان، لەلایەن زیوسی خواوەندە و ئۆلۆمپ نشینانی تر سەرنگون کرا و دوور خرانەوە بۆ تارتارۆس.[26]

[26] جەهەنەم و دونیای ژێرەوە.

# (تیتیس)



به یۆنانی:Τηθύς

به ئینگلیزی:Tethys

**تیتیس** یان تیسیس، یەکێ بوو لە شەش کچەکەی (ئۆرانوس) و (گایا) و هاوسەری ئۆکیانوس بوو.

ئۆکیانۆس لەهەمانکاتدا براشی بوو، لەم برایەی خۆی بووە خاوەنی 3هەزار نەوە و نەوەکانی بڵاوەیان کرد بەناو دەریا و سەرچەشمە و ڕوبار و چۆمەکاندا. تیتیس بۆ (ڕێیا) ڕۆڵی دایکی دەگێڕا و لەکاتی جەنگی تیتانیەکان و هێزی زیوس، ئەوی پاراست و گەیاندییە پلەو پایەی خۆی لە پایەدارانی ئۆلۆمپ نشین.

# (فیۆبە)



به یۆنانی:Φoíβη

به ئینگلیزی:Phoebe

**فیۆبە** یان فیۆبی، لە ئەفسانەکانی یۆناندا بەکچی (ئۆرانوس) و (گایا) دانراوە و یەکێکە لە تیتانیە ئۆرجینالّەکان. فیۆبە لەگەڵ برای خۆی (کیۆس)هاوسەرگیری کرد و لە کیۆس، (لیتۆ)ی دایکی ئەپۆلۆ و ئارتمیس و ئەستریا خوابانوی ئەستێرەکانی هێنایە بوون.

گێڕانەوەکان دەڵێن؛ پێشگۆی کەری پەرستگای (دێلفی) پەیوەندیدار بووە بەمەوە پێش ئەوەی ئەپۆلۆ ئەو مەقامە لە پەرستگای دێلفی وەرگرێت. بەهۆی ئەوەی کە فیۆبە دایەگەورەی ئەپۆلۆ و ئارتمیس بوو، ناوی فیۆبە یان (فۆبوس) بەناونیشانی واژەی هاوواتا و ریزهەڤ بۆ ئارتمیس و نازناوی ئەپۆلۆ بەکار هاتووە.

# (تیمیس)




بەیۆنانی:Θέμις

بەئینگلیزی:Themis

**تیمیس**، یەکێکە لەخوابانوانی ئەفسانەکانی یۆنان، کچی ئۆرانوس و گایایە، و هاوسەری زیوسە ، وەلەزیوس (هۆرای و مۆیرای)هێنایە بوون، کاری تمیس پەیوەندیدار بوو بە درکردنی دەستوارتی دروست و فتوا دان لەبەر ڕۆشنایی یاسا و سونەتەکاەندا، تیمیس خۆی ناوەکەی بەمانای (قانونی سروشت)دێت، وە تمیس توانای پێشگۆی کردنی هەبوو، ئەڵین ئەم بوو کە یەکەمجار بینای پێشگۆی کەرانی لە (دلفی)دامەزراندووە، بەسەروچاو تمیس هەرلەخۆیۆ ژنێکی عەبووس و بێتام دیاربوو ، وەلەزۆربەی داتاشراوەکان و وێنەکانیشدا وادەردەکەوێت کە تەرازوویەکی لەدەستە ڕاستی هەڵگرتووە.

# (مینۆتۆر)



به یۆنانی:Μινώταυρος

به ئینگلیزی:Minotaur

**مینۆتۆر** یان مینۆتایۆر، لەئەفسانەکانی یۆناندا، بونەوەرێکی بەسەر گا و بە لاشە مرۆڤە، پۆزیدیۆن، خواوەندی دەریاکان، لەو غەزەبەی کەلە پاشای دورگەی (کریت) واتە (مینۆس)ی گرتبوو، هاوسەری ئەو شایەیی دێوانە و سەرمەستی گایەک کرد و وای لێ کرد گایەکی خۆش بوێت، پۆزیدیۆن گاکەی وەک گای قوربانی ناردبووە لای مینۆس و لە ئەنجامدا هاوسەری

دورگەی کریت کەناوی (پازیفایە)بوو گاکەی بینی و حەزی لێ کرد و دوای ئەوە لەگەڵ گا کە جووت بوو و لەئەنجامی ئەم جوتبوونەش مینۆتۆری بەسەر گا و بەلاشە مرۆڤ هاتە بوون.

مینۆسیش کە بەمەی زانی فەرمانی بە (دادالۆس)ی پیشەسازی کریتی دا کە زیندانێکی هەزار تەگەرە و پێچاو پێچ و سەخت بۆ مینۆتۆر بسازێنن و هەمووساڵێک کە سێک لە (ئاتین)ەکان کە دەبوو خراجی پێ بدەن ساڵانە، دە گەنجی جوانخاس و ناسک بۆ خۆراکی ئەم گایە تەرخان بکرێ.

لەدیوایدا (تسیۆس) بەیارمەتی کچی شای کریت بەشوێنی ئەم گایەی زانی و دوای شەڕێکی سەخت لەناوی برد.

# (نیمازینی)



بە یۆنانی:Μνημοσύνη

بە ئینگلیزی:Mnemosyne

**نیمازینی** یان منیمۆزین، بەرجەستەکەری کەسایەتیە بەبیرەکان و خوابانوی بیرەوەریە و بە ئافریّنەر و خوابانوی زمان و شیّوەزارەکانیش دادەنریّت لە ئەفسانەکانی یۆناندا.

کچی خواوەند ئۆرانوس و خوابانو گایایە. دایکی (میوز)ەکانە[27] و لە زیوس 9 میوزی هیّناوەتە بوون.

[27] کچان و وەچەی خواوەند زیوس و خوابانو نیمازینین ، ئەم کچانەی زیوس و نیمازینی کە ژمارەیان 5 بۆ 10 میوز دەبیّت هەلگر و وەئەستۆگری هونەرەکان و ئەدەبیات و زانین و فیّربوون بوون.

# (هیپریۆن)



بەیۆنانی: Υπερίων

بەئینگلیزی:Hyperion

**هیپریۆن** یان هایپریان، یەکێک بوو لە تیتانییەکان و وەچەی ئۆرانس و گایا بوو، ئەمیش لەگەڵ خوشکی خۆی هاوسەرگیری کرد و بووە خاوەنی 3منداڵ بەناوەکانی:

- هلیۆس
- سیلنا
- ئایوس

# (پۆلیفیمۆس)



بەیۆنانی:Πολύφημος

بەئینگلیزی:Polyphemus

نەوەی خواوەند (پۆزیدیۆن) و (توسا)یە، یەکێکە لە سیکلۆپەکان، بونەوەرێکی ئەفسانەی بەشکڵ ئینسان بەڵام زۆر گەورە و توند ئاژۆیە، تاک چاوێکی لەناوەڕاستی تەوێڵی هەیە، زۆرکات بە هەیولا(غول/دێو)ی یەک چاو ناوبراوە.

دورگەیەک کە پێشبینی دەکرا (سیکلۆپەکان)تێیدا ئاکنجی بووبن بەشێک بوو لەخاکی(سیسیل)، ئەم سیکلۆپ و بونەوەرە یەک چاوانە لەوێ دەژیان لەنێو کون و کەلەبەر و ئەشکەوتەکانی ئەو شوێنەدا، وە خۆراکیان هەموو جۆرەکانی گۆشت بوو بە گۆشتی مرۆڤیشەوە، وە شڤانیان دەکرد و بەرخ و مەڕیان بۆخۆیان بەخێو دەکرد بۆ ئەوەی لە دوایدا سوودی لێ ببینن بۆ خۆراکی خۆیان.

(پۆلیفیموس)ی یەک چاو لەنێو داستانی ئۆدیسەدا ناوی هاتووە و ئەتوانین بڵێن بەناوبانگی ئەو لەوێیەوە سەرچاوەی گرت و ئەو نوسراوە بووە هۆی ئەوەی ناوی بمێنێت و لەناو نەچێت.
لەو داستانەدا هاتووە کە پۆلیفیموسی یەک چاو ئۆدیسەی بەدیل گرتبوو، کاتێ ئۆدیسەی پاڵەوانی یۆنانی و دوانزە پاسەوان و خزمەتگوزاری لە شەڕی تەروادە دەگەڕانەوە، خۆراک و ئاویان لێ بڕا و بۆ بەدەست هێنانی خۆراک و ئاو تێشوی ڕێگا لە دورگەیەک لایان دا، ئەو دورگەیە ، دورگەی سیکلۆپەکان دەرچوو، کاتێ ئۆدیسە بەبەردەم ئەشکەوتی (پۆلیفیموس)ی یەک چاودا تێپەڕدەبوون، ئەو کاتە پۆلیفیموس بۆ شڤانی ڕەوە پەزەکەی لەدەرەوەی ئەشکەوتەکەی بوو، ئۆدیسە و هاوەڵانیشی بۆ مەبەستی دزینی خۆراک چوونە نێو ئەشکەوتەمە، هەستی مڕوموشی و فزولی وای کرد لە ئۆدیسە کە بزانێت خاوەنی ئەو دورگەیە و سیکلۆپە یەک چاو درنجەکان بەچ شێوەیەکن و چۆن دەیگوزەرێنن و شیوەیان چۆنە، بۆیە بڕیاریان دا لە ئەشکەوتەکەدا خۆیان بشارنەوە تا پۆلیفیموس دەگەڕێتەوە، کە گەڕایەوە دوای شەڕێک و لەناو چوونی هاوەڵانی ئۆدیسە ، پۆلیفیموس ئۆدیسەی بەدیل گرت و لە دورگەکەدا گیری دا.

# (سێنتۆرسەکان)



به یۆنانی:Κένταυρος

به ئینگلیزی:centaurs

**سێنتۆرسەکان** یان سانتورەکان، لەنێوان ئەفسانەکانی یۆناندا بەناوبانگترین بوونەوەرە.

سێنتۆرسەکان بوەنەوەرانێکی نیوە مرۆڤ و نیوە ئەسپن، لە تەوقی سەرەوەیان تا ناوکیان مرۆڤە و لەناوکیانەوە بەرەو خوار ئەسپە، لەسەرەوە دوو دەستی هەیە و لەخواریشەوە لاشەیەکی ئەسپ ئاسای چوار پەلی هەیە، سانتورس یان سێنتۆرس ڕەچەڵەکێکه لە(ئیکسیۆن)، ئیکسۆنیش سەردەمانێک پادشایی (تسالی)[28] بووە، لەبەر مردنی باوکی ئازارێکی زۆری دەخوارد و زیوس کە بەمەی زانی هاوکاری کرد و بردییە کێوی ئۆلۆمپ تا لەوێ نیشتەجێ بێت، بەڵام ئیکسیۆن عاشقی (هێرا)ی هاوسەری زیوس بوو، زیوسیش بەمەی زانی و ڕۆژێ هەورێکی لە ئاسمانەوە لەشێوەی هێرا نارد و ئیکسیۆن ئەم هەورەی بینی و لێی نزیک بوویەوە و لەگەڵی جووت بوو، لەم تێکەڵ بوونەی ئەم هەورە هێرا شێوەیە و ئیکسیۆن بوونەوەرێک هاتە بوون بەناوی (سانتورس) و لەدوایدا لەم ڕێگایەوە سناتۆرسەکان و بوونەوەری تری دڕندە بەسەر چیای (پیلۆن) بڵاوبوونەوە.

سانتۆرسەکان لە نوسرا و فیلم و هونەرەکانی ئەمڕۆیدا زۆر بەرچاو دەکەون و دیارترین دەرکەوتنیان لە سەردەمی ئەمڕۆماندا لە فیلمی هۆبێت و هاری پۆتەردایە.

---

[28] ناوی ناوچەیەکە لەیۆنان.

# (سیکلۆپ)



به یۆنانی:Κύκλωπες

به ئینگلزی:Cyclops

**سیکلۆپەکان** بونەوەرێکی ئەفسانەین لە ئوستورەکانی یۆناندا، سەروگوێلاکێکی ناشرینیان هەیە و خاوەنی یەک چاون لە نیوان هەردوو چاویاندا واتە لە تەوێڵیاندا، کەسانێکی بەهێز بوون لەڕووی جەستەییەوە، و زۆر سەرسەخت بوون، هەمیشە بچوکترین جوڵانیان بە قودرەت و توڕەییەوە دەکرد، سیکلۆپەکان لە دورگەکاندا بەجەماعەت ئەژیان لەگەڵ یەک، کاتێ ئۆدیسۆس ڕۆشتە دورگەکەیان، هێرشیان کردە سەر قافڵەکەی و شەش دانە لە سەوڵلێدەرەکانیی ئەویان خوارد، ئۆدیسیۆسیش دای لەدانەیەکی بەهێزیان و بە مێڵەکەیەکی گەرم کوێرکرد، لە ئەفسانەکانی یۆناندا دوو جۆر لەڕەچەڵەکی سیکلۆپەکان هەن :

ڕەچەڵەکی یەکەمیان: سێ بران بەناوەکانی ( برونتیس/ئاستروپس/ئارگس) کە ئەم ڕەچەڵەکە لە سیکلۆپ لە ئەنجامی جووت بوونی خوابانو (گایا) و خواوەند (ئۆراوسـ)ـەوە هاتنە بوون.

ڕەچەڵەکی دووەمیان: کە ماباقی سیکلۆپەکان ئەکات لە نەوەی خواوەند پۆزیدیۆن بوون.

بەناو بانگترین و ناسراوترین سیکلۆپیش(پولیفیموسـ)ـە.

# (مەدیوسا)



به یۆنانی:Μέδουσα

به ئینگلیزی:Medusa

**مەدیوسا** بە مانای فەرمانڕەوا دێت و سەر بە ڕەچەڵەکی (گۆرگون)ەکانە[29]، تاکە بەرمەرگی نێو ئەو ڕەچەڵەکە بوو، وە دەی توانی هەر کەسێک کە بەچاوەکانی نیگا بکات، بیکاتە بەرد و ورد و خاشی کات.

مەدیوسا لە سەرەتادا کەنیشکێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بووە، بەڵام لەدوایدا کاتێ (پۆزیدیۆن) پاشای دەریاکان مەدیوسا لە پەرستگای (ئاتینا) دەستخەڕۆ دەکات و دەیخاپێنێت و غەزەبی لێ دەگرێت، دەبێتە ناشرین ترین و ترسناکترین درنجی مێینە و بەو شێوەیەی لێ دێت کە لەوێنەکەدا دیارە لەسەرەوە.

لەدوایدا مەدیوسای بەدەستی پاڵەوانێکی ئەفسانەکانی یۆنان واتە (پرسیۆس) دەکوژرێت و سەری دەپەڕێنرێت.پرسیۆس کە بەهۆی پارێزگاری لێ کردن و پشتیوانی کردنی (ئاتینا) و بەیارمەتی (هێرمس) بۆ نەبەردی بەرامبەر بە مەدیوسا سەفەری کردبوو، سەردەکەوێت و سەری مەدیوسا

[29] گۆرگونەکان بونەوەرێکی ئەفسانەیی یۆنانین و بەزۆری ڕەگەزی مێینەن و لاشەیان بە پێستێکی لوس داپۆشراوە و پرچیان لەبری تاڵی قژ بەمار ڕووپۆش کراوەو ئەم مارانە هەمیشە فسە فسیان دێت و دەجوڵێنەوە بەسەریانەوە و شەپۆل دەدەن وەک چۆن با یەک دەدا لەسەری ئافرەتێک و قژی تەخشان و پەخشان پێ دەکات.

لەکۆتایدا لەلاشەی جیادەکاتەوە و سەری ئەو بە خوابانو ئاتینا دەبەخشێت و ئاتیناش وەک سومبول سەری مەدیوسا وەک دوگمە و دۆلاب لەسەر سنگ و جلەانی دادەنێت.

گێڕانەوەکان دەڵێن :

لەکاتی کوشتنی مەدیوسادا ، دوو بونەوەری نویێ پەیدا بوون لە جەستەی کەوتووی مەدیوسا کە لە پۆزیدۆن و مەدیوسا بوون ، بەناوەکانی (پیگاسوس) و (کریسایور)[30] .

[30] ئەسپی باڵدار.

# (میوزەکان)



بە یۆنانی:Μούσες

بە ئینگلیزی:Muses

لە مێژووی ئەفسانەکانی یۆناندا، هەروەها لەمێژووی ئەدەب و هونەری دونیاشدا، 9 میوزەکەی ئەفسانەکانی یۆنانی کۆن پێگەیەکی تایبەتیان هەیە میوزەکان پلەو پایەیان لە نیمچە خواوەند و خوابانوەکان زیاتر و لە خواوەند و خوابانوە تەواوەکان کەمترە، زۆربەی کات لە خۆرئاوادا بە هەر بوارێکی ئەدەبیی و هونەری دەوترێت (میوزە یان موز)[31] میوزەکان کچی گەنج و شۆخ و شەنگن، وە تا ئێستاش لە پەیکەر و داتاشراوی خواوەندەکاندا پەیکەرتاشان و هونەرمەندانی ئەو بوارە هیچ پەیکەرێکیان جگە لەپەیکەری (ئافرۆدیت/ڤینۆس) هاوشێوەی پەیکەری ئەو 9 میوزە بە جوانی نەنەخشاندووە و نەتاشیوە.[32]

لە ئەفسانەکانی یۆناندا، ئەم کچانە بە کچی زیوس خواوەندی خواوەندەکان دانراون ، لەئەفسانە سەرەتایەکاندا هاتووە کە ئەم میوزانە 9خوشکی بوون بەیەک ئەندێشە و ڕۆح و دڵ و لە دواتردا فەرمانەکان و خواستەکانیان پێ دراوە، ئەم میوزانە بە هۆکاری ئارامی و خۆشی هێنان دادەنران بۆ مرۆڤەکان و لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا بە مرۆڤی هونەر مەند و ئیلهامدەر دەوترێ (میوز).

[31] وشەی میوزە یان موز؛ واتە ئیلهام بەخش و لە کوردیدا زۆرکات دەوترێ (بەهرە).

[32] کتێبی ( ئەفسانەی خوداکان/ شوجاعەدین شیفا/لاپەڕە 129)

ئەمەی خوارەوەش لیستی ناو کارەکانی میوزەکانە:

1)**کالیوپە** (خوابانوی شیعری حەماسی)



2)**کالیۆ** ( خوابانوی مێژوو)



3)**ئاراتۆ** یان **ئیراتۆ** ( خوابانوی شیعری عاشقانە و شەهوەتی)



4)**ئیوتریپ** یان **ئاوتریپ** (خوابانوی فلوت لێدان)



5)**میلپۆمین** (خوابانوی سرودی تراجیدی)



6)**پلیهێمینیا** (خوابانوی ئاواز و نەغمەی ڕۆحانی)



7)**تیرپسیکۆ** (خوابانوی سەما و گۆرانی)



8)**تالیا** یان **سالیا** (خوابانوی شیعر وبەسەرهاتی کۆمییدی)



9)**ئۆرانیا** ( خوابانوی ئەستێرەناسی).



# (هیدرا)



بە یۆنانی:Λερναία Ύδρα

بە ئینگلیزی:Lernaean Hydra

**هیدرا** جانەوەرێکی ترسناک و دڕندەیە و دەڵێن وەچەی (ئاکیدنا)[33] و (تایفۆن)[34]ە.

هیدرا لە زۆنگاوەکانی نزیک شاری کۆنی (لۆرنا لە ئارگۆس) دەژیا، شێوەی هیدرا وەک مارێکی گەورە (ئاناکۆنادا) بوو، بەڵام لەبری یەک سەر چەندین سەری هەبوو( هەندێ دەڵێن ژمارەی سەرەکانی هیدرا 5تا100 سەربووە) بەڵام بەگشتی دانراوە و نوسراوە کە هیدرا ( خاوەنی 9سەر بووە).

کەسێک بیویستبا هیدرای دڕندە لەناو بەرێت کاری زۆر سەخت دەبوو، چوون هیدرای دڕندە کاتێک سەرێکی دەبڕدرا لە شوێنی ئەو سەرە بڕدراوە سەرێکی تر دەڕوایەوە، ( هەندێ گێڕانەوەی تر هەیە دەڵێن؛ کە کاتێک سەرێکی دەبڕدرا دوو سەر لەجێکی سەرە بڕاوەکەی دەهاتەوە)، بەڵام یەکێ لەسەرەکانی هیدرا جاویدانی و هەمیشەی بوو ، وە بە هیچ شتێک نە دەبڕدرا و نە دەتوانرا لێ بکرێتەوە و بریندار بکرێ، واتە گەر گشت سەرەکانی هیدرا بپەڕێنرابایە ئەو تاکە سەرێکی دەما کە هەرگیز نەدەتوانرا بپەڕێنرێت.

هیدرای دڕندە هەم خۆی و هەم بۆنەکەشی زۆر کوشندە بوو، بەشێوەیەک کە ئەگەر نەفەسێکی هەڵبکێشایە و دەری بدابایەتەوە کەسی مەبەستی دەست و برد لەناودەبرد.

کاتێک کە هیدرا لە زۆنگاوەکان دەهاتە دەرەوە بە دانیشتوان و ئاژەڵانی ئاکنجی بوانی ئەو ناوە هەڵدەتۆقی و هێرشی بۆ دەبردن و بەڕاست وچەپدا بەهەموو سەرەکانی خۆی خەریکی لەناو بردن

---

[33]ئاکیدنا درنجێکی مێینەی نیوە پەری و نیوەکەی تری مار بوو.

[34]خاوەنی 100سەر بوو .

و قوتتدانی ئەو شتانە دەبوو کە دەهاتنە بەر دەم و ددانی.
ڕۆژێ (هێرکول) بە ئەرابەیەکی توندڕەو و هاورێ لەگەڵ کوڕێک بەناوی (ئیۆلاوس) بۆ دۆزینەوەی هیدرا سەفەری کرد بەرەو کەناراوەکانی دەریاچەی (لۆرنا لە ئارگۆس)، سەرئەنجام دوای گەڕانێکی زۆر شوێنی نهێنی هیدرایان دۆزیەوە و هێرکول وتی بە ئیۆلاوس: لە نزیک ئەرابە و ئەسپەکان بمێنێتەوە تا ئەو خۆی بەتەنها بچێت هیدرای وەحشی و دڕندە لە کون دەرکات و هێرشی بکاتە سەر بە تیر و شمشێر، دوای چۆڵەخزەی زۆر و زۆر بۆ هێنانی هیدرا لەلایەن هێرکولی پاڵەوانەوە، هایدرا خۆی نیشان دا و هاتە دەرەوە و ڕوبەڕووی هێرکول بوویەوە.
هێرکولیش شێر ئاسا و دلێرانە هێرشی کردە سەری؛ نەبەردیەکی زۆری لەگەڵدا کرد و دانە دانە سەرەکانی هیدرای لەلاشەی جیادەکردەوە بەشمشێرەکەی[35] بەڵام هێرکول دەی بینی کە هەرکاتێک سەرێکی لێ دەکاتەوە و دەچێت بۆ سەرێکی تری سەری پێشتری دەڕوێتەوە، بۆیە هێرکول بەلەز هاواری کردە ئیۆلاوس و وتی: ئاگر بکاتەوە و سەری دارێکی بە زەیت بۆ گڕبنێت و بیداتە دەستی ، تا هەرکاتێک سەرێکی هیدرا دەپەڕێنێت ، شوێنەکەی بسوتینێت تا هیدرا نەتوانێ سەری نوێ بڕوێنێتەوە، هێرکول لەم شەڕەدا زۆر ماندوو شەکەت بوو، لەکاتی لەناو بردنی هیدرادا بەم شێوە سەختە، وەخت بوو لە بۆنی هیدرا و نەفەسی هیدرای دڕندەدا خەفە ببێت و بخنکێت، بەڵام سەرئەنجام بەیارمەتی ئیۆلاوس، هێرکول توانی هەموو سەرەکانی هیدرا بپەڕێنێت و بەسوتاندنی شوێنی سەرە پەڕێندراوەکانی هیدرا ڕێگا لە دووبارە شین بوونەوەی سەرەکانی بگرێت، جگە لە یەک سەری کە وەک لەپێشتردا وتم جاویدانە و هەمیشەیی بوو، بۆیە هێرکول چی ڕق و گوڕ و هێزی لاشەی هەبوو بەکاری برد و پیشاندییە خۆی و بەهەموو قوەتی شمشێرەکەی وەشاند و لەکۆتایدا کۆتا سەری جاویدانی و هەمیشەی هیدراشی لێ کردەوە و دەست و برد شوێن براویەکەشی سوتاند و کۆتا سەری هیدرای خستە نێو چاڵ و بەردێکی تەختی قورسی لەسەر چاڵەکەش دانا.
لە دوایدا هێرکول دوای ئەوەی هیدرای لەناو برد، دەمی شمشێر و ڕمەکەی بە ژەهری زۆر مەترسیدار و کوشندەی هیدرا سواق دا و لە دوایشدا گێڕانەوەکان دەڵێن هێرکول هەر بەم شمشێر و ڕمە ژەهراوییە (نیسۆس)ی کوشتووە و لەناو بردووە.

[35] هەندێ گێڕانەوە دەڵێن بە (داس).

# (ئاتالانتە)



بە یۆنانی:Αταλάντη

بە ئینگلیزی:Atalanta

**ئاتالانتە** لە ئەفسانەکانی یۆناندا، پاکیزەیەکی ڕاو و شکار پیشەیە، کچی (یاسۆس) و (کیلومنا)یە. باوکی ئاتالانتە جگە منداڵی کوڕ حەزی بە منداڵی کچ نەبوو وە چاوی پێ هەڵنەدەهات، دوای ئەوەی ئاتالانتە لەدایک بوو ، بردیە جەنگەڵێک بەناوی (پارتنیۆن) و لەوێ فڕێی دا، ورچێک شیری بە ئاتالانتە دا و لە مردن ڕزگاری کرد، دواتر ڕاوچیانی ئەو ناوە ئاتالانتەیان درۆزیەوە و بردیان لەگەڵ خۆیان و بەخێویان کرد، گەورە بوون و چونە نێو ئەو دۆخە، ئاتالانتەی وا لێ کرد کە حەز بەکاری پیاوانە و ڕاو شکار بکات لە دارستانەکاندا و هیچ کات وەک ئافرەتێ مامەڵەی نەکردووە و نەیزانیوە بیکات و بەجەستە ئافرەتێکی جوان و بەناواخن پیاوێکی شکارچی بووە.

ئاتالانتە هاوسەرگیری نەکرد، بەڵام مەرجێکی هەبوو، کە هەرکەس بیتوانیبا ئەو مەرجە جێبەجێ بکات وەک خۆی ، ئەوە ئاتالانتە لەگەڵ ئەو کەسەدا هاوسەرگیری دەکات، مەرجەکەش ئەوەبوو کە کەسەکە بتوانێت لە پێشپڕکێ و شکاردا لێی بباتەوە، ڕۆژێ (هیپۆمینیس) لەگەڵ ئاتالانتە کەوتە پێش برکێ و بەهۆی سێوی ئاڵتونی (هیسپریس)[36] کە ئافرۆدیت بۆ سەرقاڵکردنی ئاتالانتە دەیهاوی، ئاتالانتەی سەرقاڵ کرد بە کۆکردنەوەی ئەو سێوە ئاڵتونیانە و سەر ئەنجام هیپۆمینیس پێشبڕکێکەی بردەوە، بەڵام هەڵەیەکی کرد، ئەویش ئەوە بوو کە سپاسگوزاری بەر قاپی ئافرۆدیت

[36] سێوی ئاڵتونی هیسپریس، سێوێکی ئاڵتونی نێو ئەفسانەکانە کە هیسپریسەکان پارێزگاریان لێ دەکرد، هیسپریسەکانیش کچانی خواوەند ئەتلەس و هیسپریس بوون، لەباخێکی ئەفسانەی خۆر ئاوادا خەریکی سێوی زێڕین ڕنین بوون.

نەبوو لەبیری چوو سپاسی ئەو خوابانوە بکات کە یارمەتی دەریی بووە لە پێشبڕکێکەدا، بۆیە ئافرۆدیت غەزەبی لێ گرت و هەردووکیانی کردە شێر.

# (ئاسکلیپۆس)



بە یۆنانی:Ἀσκληπιός

بە ئینگلیزی:Asclepius

**ئاسکلیپۆس** خواوەندی پزیشکی و دەرمان و چارەسەری نەخۆشی بوو لە ئەفسانەکانی یۆناندا، ئاسکلیپۆس نیشاندەری لایەنی دەرمانی و چارەسەری نەخۆش و زانیاری پزیشکییە، وە کچەکانیشی واتە:

- هیگەیا
- مادیترینە
- پاناسیا

هەریەکەیان بەجیا خویاکەر و نیشاندەری هێزی چارەسەری پزیشکی و دەرمانکاری دەردەکانن. لە ئەفسانەکانی یۆناندا هاتووە کە ئەمانە و بەتایبەت ئاسکلیپۆسی باوک ، نەک تەنها تیمارکاری دەردی نەخۆشان بوون ، بەڵکو مردووانیشیان زیندوو دەکردەوە، (فلۆتین) خواوەندی مردن، شکاتی لای خواوەندان لێ کرد و وتی ئەگەر رێگا لە ئاسکلیپۆس نەگیرێت ، ئەوا شاری مردووان هەرچی زووە بێ شارنشین دەبێت و لەناو دەچێت.

# (ئانتیۆپ)



به یۆنانی:Ἀντιόπη
به ئینگلیزی:Antiope

**ئانتیۆپ** لەئەفسانەکانی یۆناندا شاژنی ئامازۆنەکانە و تەنها کەسێکە کە لەنێوان ئامازۆنەکاندا هاوسەرگیری کردبێ، ئانتیۆپ کچی ئارس و خوشکی (میلانیپا) و هیپۆلیتا و ئۆریتیا یە ،
لەئەفسانەکاندا هاتووە کە (تیسیۆس) ئانتیۆپی فڕاندووە و ئامازۆنەکانیش
بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەن هێرشیان کردە سەر (ئاتین)؛ بەڵام شکستیان خوارد.
لەدوایدا ئانتیۆپ هاوسرگیری کرد لەگەڵ تیسیۆس و نەوەیەکی لێ خستەوە بەناوی(هیپۆلۆتوس).

# (ئاكليس)



بە یۆنانی: Ἀχιλλεύς
بە ئینگلیزی:Achilles

**ئاكليس** یان ئاخلیس پاڵەوانی سەرسوڕهێنی ئەفسانەکانی یۆنانی لە جەنگی (تەروا/تەرِوادە)دا.
هەموو لەش و لاری ئاکلیس پۆڵابوو ( واتە: هیچ چەکێک کاری لێ نەدەکرد نەک ئاسن بێت) جگە لە پاژنەی پێی، وە لە کۆتایشدا هەر لەڕێی پێکانی پاژنەی پێیەوە لەجەنگی تەروادا ژیانی بەکۆتا گەشت.
ئاکلیس کوڕی (پیلاوس) بوو ، پیلاوس پاڵەوانێکی یۆنانی و لە یاران و شوێنکەوتاونی هیراکلیس بوو.
زیوس سەردەمانێک پێش هاتنە بوونی ئاکلیس ، تێکەڵی و عەشقبازی لەگەڵ (تیتیس) ئەنجام دا و لە تیتیس ئاکلیسی هێنایە بوون، بەڵام پێشگۆیی کارانی تیتانی و لەناویشیاندا پێشگۆی کار(پرۆمیتوس) لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە ( ئاکلیس لە زیوس باڵادەستتر ببێت) ئەوی بە پیلۆسی پاڵەوان سپارد.
دواتر تیتیس ئاکلیسی برد بۆ جیهانی ژێرین و ئاکلیسی سەرەو خوار گرت بەپاژنەی پێی و لە

چۆمی ڕەشی جیهانی مردوان[37] ی چەقاند و هەڵیژەنی، تەواوی لاشەی ئاکلیس جگە لە پاژنەی پێی کە لەدەستی دایکیدا بوو خوسا و ئاکلیس بەم کارە بووە پیاوێکی پۆڵاین و لاشەی هیچ چەکێک کاری لێ نەدەکرد جگە لەپاژنەی پێی.

لە داستانی ئیلیادەدا هاتووە کە؛ لەسەرو بەندی شەڕی تەروادەدا دەمەقاڵێ و لێکگیران لەنێوان ئاکلیس و (ئاگامەمنون)[38] دروست بوو. ئاکلیس ئاگامەمنونی ناچارکرد دەست لە خۆشەویستەکەی هەڵبگرێ(واتە خۆشەویستەکەی ئاکلیس)، ئاگامەمنونیش ئاکلیسی ناچارکرد دەست لە خۆشەویستەکەی هەڵبگرێت و نافەرمانی ئاکلیسی کرد چوون خۆی بەفەرمان ڕەوا ئەزانی، لەئەنجامدا ئاکلیس قینی کرد و لە جەنگی تەروادە دا لەسەر خاکی تەروادە، کەناری گرت و نەچووە ناو شەڕەکەوە، (هیکتۆر)یش کە فەرماندەی سوپای تەروادە بوو، کوڕی مامی ئاکلیس کەناوی (پترۆکلوس)بوو لە ڕووبەڕووبونەوەیەکدا لەگەردنی دا و کوشتی و سوپای ئاگا مەمنونی پەرتەوازە کرد، پترۆکلوس زۆر هاوشێوەی ئاکلیس بوو ، بۆیە هیکتۆر هەرزوو گومانی کرد لەوەی کە ئەوە ئاکلیس بووبێ کوشتبێتی، هەرواش دەرچوو ئاکلیس نەبوو، دوای کە هەواڵی مەرگی پترۆکلوس گەشت بە ئاکلیس، ئاکلیس زۆر دلگران و تورە بوو ، بۆیە بڕیاری دا تۆڵە بستێنێتەوە و هاتەوە مەیدانی جەنگ و لەڕوبەڕوبونەوەیەکی تاکدا، بەشێوەیەکی توند و بەرقەوە هیکتۆر ئەکوژێتەوە و سوپایی تەروادەش شکست پێ دێنێت، بەڵام پێش تەواو بوونی جەنگی کۆتای و شکست پێ هێنانی سوپای تەروادە، برا بچوکی هیکتۆر و کوڕی پاشای تەروادە، ئاکلیس ئەکاتە ئامانجی تیر و تیرەکانیشی زۆر بەترسناکی ژەهراوی کردووە تایبەت بۆ لەناوبردنی ئاکلیس، و کە ئاکلیس دەبینێت تیرێکی بۆ دەهاوێت و ئەپۆلۆنیش تیرەکە ڕێنوێنی ئەکات تا پراو پڕ بدات لە پاژنەی پێی ئاکلیس و هەرواش دەبێت؛ تیرەکە دەچەقێت بە پاژنە پێی ئاکلیسدا و ژیانی ئەم پاڵەوانەش لێرەدا بەکۆتا دەگات.

---

[37] پێی دەوترا چۆمی(ئەستیکس).

[38] سەرکردەی یۆنانیەکان لە شەڕی تەروادەدا و پاشای میسینا.

# (ئامازۆنەکان)



بە یۆنانی:Ἀμαζόνες

بە ئینگلیزی: Amazons

**ئامازۆنەکان** لە ئەفسانەکانی یۆناندا، ناوی خێڵێکە کە لەکۆمەڵێک جەنگاوەری مێینە پێک هاتبوو، هیچ پیاوێکیان بەگرنگ نەدەزانی و لەلەشکر و کارو باری خۆیاندا هەرگیز پەنایان بۆ پیاو نەدەبرد و پیاوانیان قبوڵ نەبوو بۆ هیچ کاروبارێک، لە ئیلیادەدا بە (ئانتیانێرایی) ناو براون و لەلایەن هێرۆدتی مێژوو نوسیشەوە بە (ئاندرۆکتۆنیس) ناوبراون، هەرچەندە زیاتر وەک ئەفسانە دەرکەوتوون و باس کراون، بەڵام دەوترێ کە لەڕاستیدا ئەگەری زۆرە بوونیان هەبوبێت و هەقیقەتی مێژووییان هەبێت.

ئامازۆرن؛ واتای ئەم ناوە بەتەواوی ڕوونەکراوەتەوە، لەوانەیە لە ڕیشەی ناوی ئێرانی کۆنی (ها-مازان) وەرگیرابێت کە بەمانای (جەنگاوەران) دێت و لەوانەشە لە ناوی( ئامازۆیی)ەوە هاتبێ کە لە زمانی یۆنانیدا بەواتای(مەمک بڕاو) دێت.

ئەفسانەکان دەیگێڕنەوە کە ئامازۆنەکان مەمکیان دەبڕیەوە لەسەرەتای پێگەشتنیاندا، بەتایبەت مەمکی لای ڕاستی خۆیان، ئەمەشیان بۆیە دەکرد تا ڕاکێشانی تیروکەوان بۆیان ئاسانتر بێت، وە تیروکەوانیش چەکی سەرەکی و بنچینەی ئەوان بوو لە روبەڕوبوونەوە و ڕاوشکار و جەنگەکاندا، وە لەچەندین چەکی تر سوودیان وەردەگرت وەک: شمشێر و تەوری دووسەر و سپەری شیوە مانگی،وە زۆربەی هێرشەکان و نەبەردیەکانیان بە ئەسپ ئەنجام دەدا و شۆڕەسواری باش بوونە.

# (ئۆدیپ)



به یۆنانی:Οιδίποδας
به ئینگلیزی:Oedipus

**ئۆدیپ** یەکێکە لە بەناوبانگترین پاڵەوانی نێو ئەفسانەکانی یۆنان و بەسەرهاتەکانی ئۆدیپ پڕخەیاڵترین و شاعیرانەترین بەسەرهاتی نێو ئەفسانەکانە.
ئۆدیپ کوڕی (لایۆس)ی پادشای (تیب)ە کە (یوکاست)ی جوان و قەشەنگ هاوسەری بوو، ڕۆژێکیان پەنهانگۆ و پێشگۆیکارێ بن لایۆسی وتبوو: ئەو منداڵەی کە لەپشتی تۆ دەبێت، باوکی دەکوژێت و لەگەڵ دایکی خۆیدا هاوسەرگیری دەکات، لایۆسیش دوای لەدایک بوونی ئۆدیپ، بەدزی دایکیەوە ئۆدیپ دەبات بۆ (ستیریۆن) و لە شاخێک هەردوو پێیەکانی کون کرد و توند بە تاشە بەردێکەوە بەستیەوە، بەڵام شوانێک ئەو ئۆدیپی دۆزیەوە و ڕزگاری کرد و بردی بۆلای پاشای (کۆرنت) و ئەو پاشایەش ئۆدیپی گەورە کرد، لە بەر ئەوەی پێیەکانیشی کون بوو بوون ناوی لێ نا (ئۆدیپ).[39]
ئۆدیپ هەمیشە پاشای کۆرنت و شاژنی کۆرنتی بە دایک و باوکی خۆی دەزانی، وە کاتێکیش ئۆدیپ لەڕێگای غەیب گۆیانەوە ئەوەی زانی کە بابی خۆی دەکوژێ و هاوسەرگیری لەگەڵ دایکی خۆی دەکات، بۆ ئەوەی ئەو شتە ڕوونەدات بڕیاری دا بۆ هەمیشە لە کۆرنت دوور نەکەوێتەوە، بەدبەختی ئۆدیپ هەر لێرەوە دەستی پێ کرد، چونکی لە ڕێگای (بیۆس)دا لەگەڵ پیاوێکی نەناسیاودا توشی دەمە قاڵێ بوو، وردە وردە گەشتە لێدان و شەڕ و دواتر ئۆدیپ بەدارەکەی دەستی کەوتە گیانی ئەو پیاوە و کوشتی، ئەو پیاوەش هەمان لایۆسی باوکی ڕاستەقینەی خۆی

[39]واتە پێ کون.

بوو، کاتێ گەشتە شاری (تیب) هەواڵێکی سەرسوڕهێنەری بیست، کە گوایە ژنێک لاشەکەی شێرە و باڵی هەڵۆشی هەیە و ناوی (ئەبۆهۆل)ە و بەردەم دەروازەی شاری گرتووە، هەر ڕێڕەوێک بەویدا بڕوات مەتە لێکی لێ دەپرسێت، ئەگەر ئەو کەسە مەتەلەکە نەزانێت ئەوا ئەبۆهۆل ئەو کەسە لەت و پەت دەکات، وە کەسیش تائەو کات نەی توانیوە وەڵامی ڕاستی بداتەوە، بۆیە هەزاران کەسی بەدەست کوژراوە، هەموو خەڵکی شار شەو ڕۆژ کەوتبوونە ترس و لەرز، (کزیۆن) کە دوای لایۆس بووبووە فەرمانڕەوای (تیب) بڕیاری دابوو کە هەرکەسێک ئەم شارە لەدەست ئەبۆهۆل ڕزگار بکات، ئەو (یۆکاست)ی شاژنی پێشووی شار کە جوانترین ژنی ئەو شارە بوو بداتە ئەو کەسە.

ئۆدیپیش چوو بۆ چارەسەرکردن و بەرسڤی ئەو مەتەڵە، ئەبۆهۆل لێی پرسی:

(کامە بوونەوەرە کە سەرەتا چوار پێی هەیە و لە ناوەڕاستی تەمەنیدا دوو پێی هەیە و لەکۆتایشدا سێ پێی هەیە؟!)

ئۆدیپیش لەوەلامدا وتی ( ئەو بونەوەرە کە وابێت مرۆڤە؛ لەمنداڵیدا بەچوار پەلی دەڕوات و لەلاویدا لەسەر دوو پێ دەڕوات و لە پیریشدا گۆچان بەدەستەوە دەگرێت) ئەبۆهۆل کە دۆڕابوو لەتوڕەیدا خۆی خۆی فڕێ دایە ناو دەریا، ئۆدیپیش چووە ئەو شارە و بووبە مێردی (یۆکاست) و بەم شێوەیە بێئەوەی بەخۆی بزانێت لەگەڵ دایکیدا بووبە هاوسەر و لە ئەو جوتبوونەشی دوو کوڕ و دووکچی بوو، کە بەناوبانگترینی ئەم منالانە کچێکی بوو بەناوی (ئانتیگۆن).

ماوەیەک دوای ئەمە گرانیەکی سەخت شاری تیبی گرتەوە، ئۆدیپ لەو کاتەدا ببوە پاشایی تیب، داوای لە غەیب گۆیان کرد ڕێگا چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە، ئەوانیش گوتبوویان؛ ئەم گرانییە کاتێک کۆتایی دێت کە بکوژی لایوس (پاشای پێشووی ئەو شارە و باوکی ڕاستەقنەی ئۆدیپ) لەو شارە بڕوات، ئۆدیپیش سوێندی خوارد ئەو بکوژە بدۆزێتەوە و سزایەکی توندی بدات، بەلام دوای لێکۆڵینەوە و بەدواداچونێکی زۆر، بۆی دەرکەوت بکوژەکە بۆخۆیەتی، ئەو کات یۆکاستیش زانی ئەمە هەمان کوڕەکەی خۆیەتی کە ئێستا بۆتە مێردی، ئۆدیپ لەشەرمەزاریدا هەردوو چاوی خۆی دەرهێنا و دەستی نایە ناو دەستی ئانتیگۆنی کچی و بەرەو بیابان سەری خۆی هەڵگرت.[40]

[40]کتێبی (ئەفسانەی خواکان/شوجاعەدین شیف/ لاپەڕە 175-176)

# (ئیکاروس)



به یۆنانی:Ίκαρος
به ئینگلیزی:Icarus

**ئیکاروس** به یارمەتی باڵەکانی لە زیندانی (مینۆس/ مینۆس پاشای کریت بوو، کوڕی زیوس و ئۆروپا بوو) لەتەک باوکیدا واتە (دایدالۆس) هەڵهات.
باڵەکانی ئیکاروس لە مۆم و پەڕ دروست کرابوو، بە بوونی دواخوازی باوکی هەڵفڕی و زۆر نزیک بوویەوە لە خۆر، هێندە ڕۆشت و نزیک بوویەوە لەکاتی هەڵهاتنی لە زیندان کە باڵەکانی بوونە ئاو داچۆڕان و ئیکارۆسیش بەربوویەوە لە ئاسمانەوە بۆ ناو دەریا و ئەو دەریای ئیکارۆسی تێکەوت ناوی ( ئیکاریا) بوو.

# (پانتیسیلیا)



به یۆنانی:Πενθεσίλεια
به ئینگلیزی:Penthesilea

**پانتیسیلیا** بەمانایی (شینگێڕی و تازێباری بەهۆی خەڵکیەوە) دێت، لە ئەفسانەکانی یۆناندا بە کچی (ئارس) و (ئۆتێرا) دانراوە، خوشکی (هیپۆلیتا) و (ئانتیوپ) و (میلانیپا)یە، یەکێکە لە شاژنە ئامازۆنەکان، لەدوای شەڕی تەروادە بەدیاری کراوی دوای مردنیی هیکتۆر هاوشانی خەڵکی تەورادە دژیی یۆنانیەکان جەنگا، ئاکلیس ئەم ژنەی حەز لێ بوو وەخۆشی ئەویست، ڕۆژێ لەکاتی ڕاو کردندا کە ئاکلیس و خوشکەکەی واتە (هیپۆلیتا) خەریکی ڕاو شکار بوون ، بەشێوەیەکی نائاگایانە کە دەست ئەنقەستی نەبوو پانتیسیلیای کوشت، دوای ئەوە ئاکلیس زۆر دڵگران بوو بەشیوەیەک کە هەمیشە ئارەزووی مەرگی ئەکرد بۆخۆی، کاتێ کە پانتیسیلیا بەدەستی ئاکلیس کوژرا، چاوەکانی پانتیسیلیا بەدەستی (سیرسیتیس) دەرهێنارا و ئاکلیسیش کە بەمەی زانی زۆر تورە بوو وە سیرسیتیسی کوشت.

# (بليرۆفۆن)



به یۆنانی:Βελλερεφόντης
به ئینگلیزی:Bellerophon

**بليرۆفۆن** له ئەفسانەكانی یۆناندا. كوڕی (گلاوكۆس)ە.[41]
باشترین و نایابترین ئەسپسواری زەمانی خۆی بوو، لەتەمەنێكی كەمدا فێری ئەسپسواری بوو لەلای باوكی، لەكارەكانیدا هەر لەسەرەتای تەمەنییەوە تا كۆتای كەسایەتییەكی زیرەک و گرجوگۆڵ بوو، كاتێ بوویە شانزە ساڵ حەزێكی زۆری هەبوو بۆ گورێخی و سەركێشی كردن، وەلەدواتردا ئەم حەزەی وای لێ كرد كە؛ سەفەر بكات.
لەو سەفەرەیدا بە (پرۆیتۆس)[42] ئاشنابوو، پرۆیتۆس بەڕوكەشی هاورێیەتی خۆی بۆ بليرفۆن نیشاندا و لە ڕاستیشدا لەناخەوە زۆر حەسوودی بە بليرفۆن دەبرد و هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوو كە سەری تێنێت.
بليرفۆن لەبەر ئەوەی برایەكی خۆی كوشتبوو بەبێ ویست بەپەلە لە (ئەفورا) دووركەوتەوە و ڕۆشتە لای پرۆیتۆس، (ئەستنبویا) هاوسەری پرۆیتۆس، لەخۆڕا بليرفۆنی بە تۆمەتی دەستدرێژی

[41] گلاوكۆس پاشای (ئەفورا) بوو.
[42] پرۆیتۆس پادشای (تیرونوس) بوو.

کردنە سەری تۆمەتبارکرد، پرۆیتۆسیش بلیرفۆنی بەپەیامێکەوە ناردییە لای خەزوری خۆی کەناوی (یوباتیس) بوو. یوباتیسیش بلیرفۆنی نارد بۆ جەنگی (خیمایرا)، تا ڕوبەڕووی ئەژدهایەکی ئاگراوی و دڕندە و ترسناک ببێتە لەوێ، مەبەستی ناردنی بلیرفۆن بۆ شەڕی ئەو ئەژدیهایە ئەوە بوو کە سەری بلیرفۆن بخۆن و لەناوی بەرن، بەڵام بلیرفۆن بە یارمەتی ئەسپە باڵدارەکەی کە خوابانو (ئاتینا) بە ئەوی بەخشی بوو، توانی دوای نەبەردییەک ئەژدیهاکە لەناو بەرێت، بلیرفۆن دواتر سەرکێشی کرد و ویستی بە ئەسپە باڵدارەکەی بڕوات بۆ ئاسمان و شانشینی خودایان لە ئاسمان، بەڵام زیوس بەمەی زانی و خەرەنگەزێکی نارد تا ئەسپەکەی بلیرفۆن بەگیربێنێت و بلیرفۆن لە سوار ئەسپەکەی بخاتە خوارەوە، ئەسپەکەش کاتێ خەرەنگەز تێی وەشا هەروای کرد و هێندە زۆری بۆهات بلیرفۆنی خستە خوارەوە لەسەر پشتی و لە سزای ئەم کارەشیدا بلیرفۆن دوای شکستی بۆ ئاسمان چوونی، بۆ هەمیشە لە ژێر زەویدا مایەوە.

# (تانتالوس)



بە یۆنانی: Τάνταλος
بە ئینگلیزی: Tantalus

**تانتالوس** لە ئەفسانەکانی یۆناندا بەکوڕی زیوس و پلۆتۆن دانراوە.

هاوسەرگیری لەگەڵ ( دیۆنە) ئەنجامدا و لە دیۆنە بووە خاوەنی سێ نەوە، بەناوەکانی:

- پیلۆپس
- نیۆبە
- برۆتیاس

تانتالوس بۆ کۆبوونەوەی خواوەندان و پایەداران بۆ خواردنێک میوانداری کرا، بەڵام خواردن و شەرابی خواوەندانی فڕاند و نهینی خواوەندانی بۆ مرۆڤەکان ئاشکرا کرد، و لەسزای ئەمەشدا بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا زیندانی کرا.

# (پرسیوس)



بە یۆنانی: Περσεύς

بە ئینگلیزی:Perseus

**پرسیوس** لەئەفسانەکانی یۆناندا، کوڕی خواوەند(زیوس) و (دانایی)یە.

پرسیۆس یەکەمین قارەمانی ئەفسانەکانی یۆنان و هەروەها شانبەشانی ناوبانگی (ئاکلیس) ئەمیش بەناوبانگترین قارەمانە کە تا هەنوکە ئەفسانەنوسان تۆماریان کردبێت، دایکی پرسیۆس (دانایی) پرسیوسی لە خواوەندی خواوەندان (زیوس) بوو، ئەم داستانە کە نوسراوەتەوە زۆر لە داستانی لەدایک بوونی عیسای مەسیح دەچێت، (ئاکریسۆس)باوکی دانایی، دانایی کچی و پرسیوسی لە سندوقێک هاوی و خستنییە دەریاوە تا لەناو بچن، زیوسیش دانای و پرسیوسی بە دورگەیەکی ئارام گەیاند و لەو دورگەیە (پۆلیدیکتس) پرسیوس و دانای ڕزگارکرد و پاراستنی.

دواتر پۆلیدیکتس کە پاشای دورگەی (سریفوس) بوو؛ عاشقی دایکی پرسوس بوو، بەڵام پۆلیدیکتس؛ پرسیوسی بە ڕێگر دەبینی لەگەشتن بە دانایی، پلانێکی دانا تا پرسیوس بەهیلاکدا ببات و لەناوی بەرێت، وەڕای سپارد کە بڕوات کەلەی سەری (مەدیوسا) بهێنێت بۆی،

مەدیوساش ئافرەتێکی وەها ترسناک بوو (وەک لە پێشتردا باسم کردووە) کە سەیری هەرشتێکی بکردبا دەیتوانی بیکاتە بەردێکی وشک و تەق، بۆ سەرکەوتنی پرسیۆس لەم کارەیدا، هەردانەیەک لە خواوەندان شتێکیان بە پرسیۆس بەخشی؛ (کرۆنوس) ئەو شمشێرەی بە پرسیوس بە خشی کە گەڵ و گونی (ئۆرانوس)ی لە زوودا پێ بڕی بوو، (هادیس)خواوەندی مەرگ کڵاوێکی بە پسیۆس بەخشی کە هەرکات لەسەری بکردبا؛ نادیار دەبوو و ون دەبوو لە پێش چاوان، (هێرمس)یش جوتێ پێڵاوی بەو دا کە بە هۆیەوە دەیتوانی بفڕی، پرسیوس سەری مەدیوسای بە (ئاتینا)بەخشی، و گەر بڕوانین لە نەخشێنراو وێنە و داتاشراوەکان کە بۆ ئاتیناش دروستکراون، ئەوا لەسەر سپەرەکەی ئاتینا سەری مەدیوسا دەبینین.

لەکاتی گەڕانەوەیدا پرسیوس کە سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو بەسەر مەدیوسادا و سەری پەڕاندبوو، لە دوورگەیەکدا لای دا، شاژنی پاشای ئەو دورگەیە کە بە جوانی خۆی دەنازی، خواوەندی دەریا(پۆزیدیۆن)ی وا لێ کردبوو کە تەمبێی بکات و لەسەر تاشەبەردێکدا بەستبوویەوە تا ئەژدیهایەک بێت و بیخوات، بەڵام پرسیوس لەکاتی گەڕانەوەیدا کەلای دابوو لەو دورگەیە بینی و ئەژدیها دەریاییەکەی لەناو برد و هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ژنەدا ئەنجام دا.

# (پلیۆس)



به یۆنانی:Πηλεύς
به ئینگلیزی: Peleus

**پلیۆس** له ئەفسانەکانی یۆناندا، کوڕی(ئایاکۆس) و (ئەندیاس)ە، هاوسەری (تتیس) و باوکی (ئاکلیس)ە.

زیوس عاشقی(تیتیس)بوو، بەڵام لەبەرئەوەی بیستبووی کە ڕۆڵەکەی تیتیس گەر بێتە بوون ئەوا لەو باوکەی بەهێزتر ئەبێ کە لیێ هاتۆتە بوون، تیتیسی نەهێنا و کردیە هاوسەری پلیۆس، و لەپەیوەندی ئەم دوانەش (ئاکلیس)ی پاڵەوان هاتە بوون کە بووە پاڵەوانی جەنگی تەروا و هەر لەکۆتای و ئەو جەنگەشدا کوژرا وەک لە پێشتردا باسم کرد.

# (پاندۆرا)



بە یۆنانی:Πανδώρα

بە ئینگلیزی:Pandora

**پاندۆرا** لە ئەفسانەکانی یۆناندا یەکەمین ژنی سەر ڕوی زەوییە، کە (هیفایستۆس) ئەوی بە فەرمانی زیوس لە ئاو و گوڵ سازاند، خواوەندان خێر و بەرەکەت و فەڕی زۆریان بەسەر ئەم ژنەدا ڕژاندبوو، بۆ نموونە؛ خوابانو(ئافرۆدیت) جوانی و شۆخ و شەنگی بەم ژنە بەخشی و خواوەند (ئەپۆلۆ) ئاواز و میوزیکی پێ بەخشی و خواوەند (هێرمس) بیروباوەڕی ئیلاهیاتی و ئاینی پێ بەخشی و ئیتر خواوەندانی ئۆلۆمپ هەریەکەیان و بەشێوەیەک ئەم ژنەیان بەهرەوەر کرد لە خەڵاتەکانی خۆیان، بۆیە لە کۆتایدا هێرمس نازاناوی (هەموو بەخشینەکان)ی بە پاندۆرا بەخشی.

بەڵام پاندۆرا سندوقێکی پەیدا کردبوو، کە خواوەندان پێیان وتبوو نابێ بیکاتەوە، بەڵام پاندۆرا دوای ئەو هەمووە بەخشندەییەی کە خواوەندان لەگەڵیدا کردیان نەیتوانی فەرمان بەردار و گوێ لەمستی ویستی خواوەندان ببێت و سندوقەکەی کردەوە و لە ئەنجامدا دوای کردنەوەی سندوقەکە ئازار و ناخۆشی و پێشهاتە خراپەکان بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە و تەنها شتێ لەناو سندوقەکە مایەوە،ئەویش (ئومێد/هیوا)بوو کە بڵاو نەبوویەوە بەسەر زەویدا.

# (پینالوپە)



به یۆنانی:Πηνελόπη

به ئینگلیزی: Penelope

**پینالۆپە** یان پینالوپ؛ کچی (ئیکایوس) و (پریبۆیا)یە و لە ئەفسانەکانی یۆناندا بەهاوسەری (ئۆدیسۆس/ئۆدیسە) و دایکی (تلیماخۆس) دانراوە.

پینالۆپ بەهۆی جوانیەکەیەوە پێش هاوسەرگیری و دوای هاوسەرگیریش داخوازیکارانێکی زۆری هەبوو، باوکی بۆ ڕێگرتن لە دەنگە دەنگ و شانشانێنی داخوازیکارانی، پێشبڕکێیەکی ڕێکخست، کە هەرکەس ئەو پێشپڕکێیەی ببردایەتەوە دەبوویە هاوسەری کچەکەی، لەم پێشبڕکێیەدا ئۆدیسۆسی دلێر و قارەمان بردیەوە و بوویە هاوسەری پینالۆپ.

بەڵام ئۆدیسۆس دوای 20ساڵ لە ونبوونی[43] پینالۆپی خستبوویە گوزەرانێکی ناخۆشەوە و بەدرێژایی هەموو ئەو 20 ساڵە پینالۆپ داخوازیکاران وازیان لێ نەدەهێنا و بەردەرگایان لێ گرتبوو وە هەریەکەیان هەر ڕۆژەو عەرزی عەزەڵات و دەسەڵاتی خۆی بۆ دەکرد تا شووی پێ بکات و پیننالۆپیش زۆر وەفادارانە لەبەر هاوسەرە ونبووە بێ سەرو شوێنەکەی ئاوڕی لەکەسیان نەدەدایەوە و هەرچەند فشاریان بۆ دەهێنا ، بەڵام هەر ڕۆژە و بەبیانویەک بەڕێی دەکردن.

---

[43] ئۆدیسۆس لەدوای جەنگی تەروا لەکاتی گەڕانەوەیدا لەو جەنگە ون بوو بوو ، وە پەریەکی دەریای لەلای خۆی گلی دابوویەوە و نەیدەهێشت بڕوا و لەدورگەیەکدا زیندانی کردبوو.

یەکێ لە حیلە و فێڵە ناوادارەکانی پینالۆپ بۆ جوابکردنی داخوازیکارەکانی ئەوە بوو کە؛ دەستی دایە دورینی پارچەیەک جل و بەرگ و وتی بە داخوازیکارانی؛ هەرکات لە دورینی ئەو پارچە قوماشە لێ بوویەوە ، ئەوکات بڕیار دەدات شوبکات بەکامیان، وە ڕۆژ دەهاا و ڕۆژ دەچوو دورینی ئەم پارچە قوماشە هەر تەواو نەدەبوو!

هۆکاری تەواو نەبوونەکەشی ئەوە بوو کە پینالۆپ هەموو ڕۆژێ چی دەدوری شەوان هەڵی دەوەشاندەوە، ئەم فێڵەی پینالۆپ سێ ساڵ داخوازیکارانی ڕاگرت، بەڵام لەدوایدا هەر ئاشکرا بوو.

دوای ئاشکرا بوونی و چاری نەما و بیری بۆ شتێ تر چوو وتی بە داخوازیکارانی: هەرکەسێک بتوانێت ئەو تیر و کەوانەی کە (ئۆدیسۆس)ی هاوسەری دوای خۆی بەجێی هێشتبوو ڕابکێشێت ئەو هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، بۆیە پێشبڕکێکە دەستی پێ کرد و کەس لە داخوازیکاران نەی توانی تەنها کەسێک نەبێ کە توانی و ئەو کەسەش (ئۆدیسۆس)خۆی بوو، کە دوای ئەو هەمووە ساڵە گەڕابوویەوە و لەو کاتەدا هەموو داخوازیکارە بێ مێشکەکانی هاوسەرەکەی کەچەندین ساڵ بوو زۆریان هێنابوو بۆ پینالۆپ، لەناو برد و کوشتنی.

بەم هۆیەوە تا ئێستا پینالۆپ بە سیمبولی (وەفاداری نێوان ژن و مێردەکان) دادەنرێت.[44]

[44]کتێبی(الهەها و ایزدان/بە کوشش:امیر بهنام/ص158)

# (تیسیۆس)



به یۆنانی:Θησεύς

به ئینگلیزی: Theseus

**تیسیۆس** یان ثیسیۆس؛ کوڕی (ئایگیۆس) و (ئایترا)یە، لەئەفسانەکانی یۆناندا پادشا و قارەمانی (ئاتین)ە.

به گەنجێتی کە لە (ئاتین)ەوە دەبرا بۆ مینۆس، تا ببێتە خۆراکی(مینوتاروس/مینۆتۆر)، (ئاریادنا) کچی (مینۆس) عاشقی بوو، وەتوانی لە لابیرنت(زیندانی هەزار ڕێ کە شوێنێک بوو بۆ مینۆتۆر چێ کرابوو) ڕزگاری بکات و تیسیۆسیش تۆڵە لە مینۆتۆر بکاتەوە ولەو شوێنە ڕزگاری ببێت و بێتە دەرەوە.

# (پیتۆن)



به یۆنانی:Πύθων

به ئینگلیزی:Python

**پیتۆن** ئەژدیهایەکی ترسناک بوو کە لە شێوەی (گا)دا بوو.

دەگێڕنەوە لەبارەی ئەم ئەفسانەیەوە و دەڵێن کە : ئاپۆلۆن شیری دایکی خۆی نەدەخوارد، چونکە (تیمیس)[45] (نیکتار/شیری خواوندەکان)ە خستە دەمی ئاپۆلۆنەوە و تێرشیری کرد، ئەم شیر پێ دانەش بۆ هەمیشە ئاپۆلۆنی تێرکرد، کاتەک ئاپۆلۆن منداڵێکی شیرە خۆرە بوو، لەگەڵ (پیتۆن)ی ئەژدیهادا تێ گیرا، دەڵێن کە؛ پیتۆن ئەژدیهایەک بووە کە زادەی سەر زەوی بووە.

پیتۆن لەسەرەتادا (هێرا) ناردبووی تا دایکی ئاپۆلۆن لەناو ببات، بەڵام خواوەندی دەریاکان[46] ئەو ژنەی[47] لەناو شەپۆلەکانی خۆیدا شاردەوە و پیتۆنی ئەژدیهاش نەیتوانی بیدۆزێتەوە و ناچار گەڕایەوە جەنگەڵی (پارناس).

ئاپۆلۆنیش چوار ڕۆژ دوای لەدایک بوونی، هەوڵی دا شوێنێک بدۆزیتەوە تا پەرستگای خۆی لێ دروست بکات، بەخۆی و تیروکەوانەکەی کە خواوەندی پیشەسازی و سنعەت پێی بەخشیبوو هاتە خوارەوە لە کێوی ئۆڵۆمپ، بەسەر چەندین وشکانی و دورگەدا تێپەری تا گەشتە (کریسیا)، پەریەکی دارستانی کە لەو ناوچەدا حوکمڕانی دەکرد، ئاپۆلۆنی فریودا و بەرەو ئەو دارستانەی

---

[45] یەکێکە لەوانەی عەشقبازی لەتەک زیوسدا کردووە.

[46] مەبەست (پۆزیدۆن)ە.

[47] (ئەو ژنە) مەبەست لە (لیۆ)ی دایکی ئاپۆلۆن و مەعشوقەی کۆنی زیوسە.

نارد کە پیتۆنی ئەژدیهای لێ بوو، کاتێ پیتۆنی ئەژدیهاش ئاپۆلۆنی بینی زۆر تورە بوو وە ئاگری لەدەمیەوە دەرهاویشت بۆی، بەڵام ئاپۆلۆن بەتیری خواوەندی پیشەسازی و سنعەت لێی هەڵگەڕایەوە و هێرشی کردە سەر و بە خراپی برینداری کرد و خوێنی ڕژاندە سەرزەوی و بەدەم ئازارەوە ئەژدیهای پیتۆن هێندە ناڵاندی تا گیانی دەرچوو.

دواتریش ئاپۆلۆن لەو شوێنەدا پەرستگا بەناو بانگەکەی خۆی بەناوی (دیلف) دروست کرد و یادگاریەکانی ئەم سەرکەوتنەی ئاپۆلۆنیش لەپەرستگای دیلف دا نەخشێنرا و مایەوە.[48]

[48] کتێبی (ئەفسانەی خواکان/شوجاعەدین شیفا/لاپەڕە 41 و42)

# (سیزیفۆس)



بە یۆنانی:Σίσυφος
بە ئینگلیزی: Sisyphus

**سیزفۆس** یان سیزیف، پاڵەوانێکی ئەفسانەکانی یۆنانە، کوڕی (ئایولوس)[49] و (ئەنارتا)یە و هاوسەری (میرۆپا)یە.

لە ئەفسانەکاندا هاتووە کە سیزیف پادشای(کورینتوس)[50]بووە، وە بەهۆی خۆبەزلزانی و فێڵکردن سزادراوە. سیزیف توانی خواوەندی مردن (تانتالوس) هەڵخڵەتێنێ ئەمەش وای کرد کە زیوسی گەورەی خواوەندەکان تورە بکات و سزای بدات بەوەی کە بەردێکی گەورە لە خوارەوەی چیایەک بۆ سەرەوە چیایەک ببات و هەرکاتێک بەردەکە دەگەیشتە لووتکەکە، جارێکی تر خل دەبۆوە بۆ دۆڵەکە و جارێکی دی سیزیف دەیبردەوە سەرەوە، ئەم کارە بۆ هەمیشە بەردەوام بوو. بەم جۆرە سیزیف بووە هێمای ئەشکەنجە و سزای هەمیشەیی.

[49] ئایولوس پادشای (تسالی)بوو.
[50] ناوچەیەکە لە یۆنان.

# (هێرکول)

بە یۆنانی:Ἡρακλῆς
بە ئینگلیزی: Hercules

**هێرکول** یان هێراکلیس؛ لەوانەیە داستانی هێرکولی قارەمانی ئەفسانەیی یۆنانی کۆن بەناوبانگترین ئەفسانەبێت کەلەدینیایی کۆنەوە وەک یادگرای بۆمان ماوەتەوە تا ئێستا.

هێرکول گەورەترین و قارەمانترین مرۆڤ بووە لە ئەفسانەکانی یۆنان و ڕۆمدا، هێرکول داتاشرا و پەیکەر و وێنەکان کە بۆی نەخشێنراوە هەمیشە وای دەرخستووە کە کەسایەتییەکی بەشان و شەوکەت و بازوو بەهێز و قایم بووە، وە ئەفسانەی ئەم کەسایەتییە هێندە بەناو بانگە کە لەناو کوردی خۆشماندا کەسێک زۆر بەهێز و بەزەبر بێت پێی دەڵێن: (لە هەرقڵ دەچێ!) واتە تا هەنوکەش نمونەی بەهێزی و بەهەیبەتییە لەناو زۆربەی گەلاندا.

لە یۆنانیشدا بەتایبەتی بەنموونی بەهێزی و لەش زەخمی و بەتوانای ناسراوە.

هێرکول یەکێکە لەو پاڵەوانانەی کە بەتەواوی سەرڕاست و ڕەسەنە، چونکە هەمووکاتێ ئەم هێز و بازوە زۆرەی خۆی لەپێناو بەرگریکرن لە ستەمکاران بەکارهێناوە بۆ تێک شکاندنی هیزی ستەمکاران و هێزی ئەهریمەنی.

هەمیشە هێرکول لەسەر شێوەی پاڵەوانێکی ئاسنین و بازۆڵە بەهێز و سەر بچوک(بەبەراورد بەلاشەی) دروستکراوە و نەخشێنراوە. لەزۆربەی ئەو پەیکەرانەی کە بۆی دروستکراون بەپێوەیە و خۆی بەسەر دارەدەستێکی گەورەدا داوە و لەڕوخساریدا نیشانەی بەهێزی بەدی دەکرێت و وەک ئەوە دیارە کە ئەو هەرگیز تێکناشکێت و وا دەردەکەوێت هەمیشە کە ئەرکی گرنگی هەیە و پێویستە ئەنجامیان بدات ، ئەرک گەلێک کە ئەم نەبێت کەس ناتوانێ ئەنجامی بدات.

وە لەهەموو یۆناندا هێرکول بەچاوی نیمچە خواوەندەوە سەیرکراوە کە توانای بەسەر هەموو پاڵەوانەکانی جیهاندا هەیە.

وە لە یۆناندا داستانی هێرکول پێش خوێندنی ئەلف با بە منداڵان دەوتراوە بەشێوەیەک کەتا مردن لەبیریان نەچێتەوە.

ئەو 12 قارەمانێتییە چییە کە هێرکولی پێ دەناسرێت ؟

لە ماوەی ژیانیدا هێرکول زۆر نەبەردی ئەنجام دا و ئەم سەرکەوتنانەش کە ژمارەیان دوانزە دانە بوو بە دوانزە سەرکەوتنەکەی هێرکول یان بە دوازدە (خوان)ی هێرکول ناسراوە.

ئەم سەرکەوتنانەی هێرکولیش هەریەکەیان بەجیا لەسەردەمە کۆن و نوێکاندا بوونەتە ئیلهام بەخشی چەندین نوسەر و ئەدیب و شاکاری پێیان هێناوەتە بوون.

دوانزە قارەمانێتیەکەی هێرکول(یان دوانزە داستانەکەی هێرکول) بەم شێوەیەیە:

## شێر:



یەکەم کاری هێرکول، بەفەرمانی (ئۆریستە) کردی، شەڕی شێرێکی زەبەلاح بوو کە بیکوژێت، هێرکول زۆرتیری گرتە ئەو ئاژەڵە و هیچ یەک لەم تیرانە کاریگەر نەبوون، چونکە ئەو شێرە زۆر بەهێز و سەر سەخت بوو، ناچار هێرکول چنگی لەچنگی شێرەکە نا و کەوتە زۆران بازی دەستەو یەخە لەگەڵیدا و لە کۆتایدا خنکاندی، ئینجا شێرەکەی کەوڵ کرد و پێستەکەی خۆشەکرد و لەبەری کرد و ئیتر هێرکول دوای ئەوەی ئەو پێستەیەی پۆشی تیر بە سەختی کاری لێ دەکرد، دواتر شێرەکەی هێنایە ناو شار و نیشانی خەڵکی دا تاترسیان بڕەوێتەوە لەو دڕندەیە.

## ماری 9نۆ سەر:



ئەم ئاژەڵە ئەژدیهایەکی دەریایی دڕندە بوو، کە 9سەری هەبوو، لە زۆنگاوێکدا ئەژیا بەناوی (لیرن)دا ژیانی دەبردە سەر، هەرکات ئەم دڕندەیە لەو زۆنگاوە بهاتبایەتە دەرەوە مەڕوماڵاتی هەڵکی دەخوارد و کێڵگەکانی وێران دەکرد، وەگڕ لەدەمی ئەم دڕندەیەوە دەهاتە دەر و ئەم گڕەش بەس بوو بۆ ئەوەی تا چاو بڕبکات ڕەز و باخەکان بسوتێنێت، هیچ کەس نەیدەتوانی ئەم دڕندە نەگریسە لەناوببات و ڕووبەڕووی ببێتەوە، هێرکولیش کەبەمەی زانی هێرشی بۆ کرد و بەتیرە گڕدارەکانی خۆی ئەو ئەژدیهای ناچار کرد بێتە دەرەوە هەرچەندە زەبرە توندەکانی کاریگەری ئەوتۆیان نەبوو لەسەر ئەو ئەژدیهایە، لەکۆتایدا هێرکول بەسوتاندنی لەناوی برد.

## بەرازی ئادیمانت:



ئەم بەرازە یەکانەیە سالّی جارێک لەکێوەکانی نزیک (ئارکادی) دەهاتە خوارەوە و ئەو ناوەی وێراندەکرد، سەرئەنجام هێرکول فریایی خەڵکی ئەو شوێنەش کەوت و بەرازە گەورە دڕندەکەی گرت و بردی بۆ (تێرینتی) پایتەختی پاشایەتی (ئۆریستا) و پادشای ئەوێش لەبینینی ئەو ئاژەڵە دڕندەیە ئەوەندە ترسا کە ڕای کردە ژوورەکەی خۆی و دەرگای لەسەر خۆی بەتوندی داخست.

## باڵندەگۆشتخۆرەکانی زۆنگاوی ئاستیمفاڵ:



زۆنگاوی ئاستیمفاڵ، ببوە پەناگەی باڵندەی گۆشتخۆری زەبەلاح، کە چنگ و دەنوکی ئاسنینیان هەبوو، خواردنیان گۆشتی مرۆڤ بوو وە ژمارەیان زۆر ئێجگار زۆر بوو، هێندە زۆر کە دەفڕین بەری خۆریان دەگرت، هێرکولیش چەند دەهۆڵێکی لە پۆڵا دروست کرد و چەند کەسێکیشی بۆ شوێنی باڵندە دڕندەکان لەگەڵ خۆیدا برد، لەوکاتەی کە باڵندەکان نوستبوون، لەپڕ دەستیان بەلێدانی دەهۆڵەکان کرد، باڵندەکانیش زەندەقیان چوو و وەبەپەشۆکاوی هەریەکەی بەلایەکدا فڕی و هێرکولیش یەک یەک ئەوانی کردە نیشانەی ئەوتیرانەی کە بەخوێنی ئەژدیهای پیتۆن شەلاڵی کردبوون و هەموویانی کوشت.

## مامزی گێوی سیریند:



لە چیایی سریندا، مامزێک هەبوو شاخەکانی زێڕبوو، سمەکانی قاچی لە پۆلابوون، هیچ ڕاوچیەک نەدەتوانی و نەیدەوێرا لێی نزیک ببێتەوە، (ئۆریستا) فەرمانی دا بەهێرکول ئەو مامزەی بۆ ڕاوبکات، هێرکولیش یەک ساڵی تەواو بەدوای ئەو مامزەدا گەڕا تا سەرئەنجام ڕۆژێک لە دەریاچەی لادون گرتی و بردی بۆ ئۆریستا.

## پاککردنەوەی گەوڕی ئۆگیانس:



ئۆگیانسی پادشایی ئالیس مەڕوماڵاتێکی زۆری هەبوو، لەناو ئەمانەشدا دوانزە گای کێوی سپی کە موڵکی خواوەندی هەتاو بوون، یەکێ لەو گا دڕندانە ناوی فاستۆن بوو، وەک گەوهەر دەدرەخشایەوە، بەڵام پادشای ئالیس ئەو ئاژەڵانەی لەگەوڕێکی پیسدا دانابوون، هێرکول پێشنیاری ئەوەی بۆ پادشا کرد کە بچێت گەوڕەکەی بۆ پاک بکاتەوە، بەمەرجێک یەک لەسەر دەی ببێتە ماڵی خۆی، پادشا ئەمەی قبوڵکرد و هێرکول دوو کونی لەدیوای گەوڕەکان کرد و هەردوو چەمی (ئالف و (پینا)ی بەویدا ڕەد کرد و ئاوی ەو دوو چەمە هەموو تەرسەقول و پیسایی تەپاڵەکانی ڕامالْی و وەک گەوڕەکەی وەک ئاوێنە لێ کرد، بەڵام پاشا بەیانوی ئەوەی هێرکول ناتوانێت سەربەخۆ کارێک بکات و دەبێ فەرمانی (ئۆریستا) جێبەجێبکات، ئەو کرێیەی بڕیاربوو بیداتێ نەیدایە و دواتریش هێرکول تۆلەی ئەمەی لێ کردەوە.

## گای دڕندەی کریت:



پۆزیدیۆن خواوەندی دەریا، گایەکی بەدیاری دا بە مینۆسی پادشای دورگەی کریت و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ئەو پادشایەش خێر بە پەرستگای ئەوبدات، بەڵام چوون پادشای کریت ئەم کارەی نەکرد، پۆزیدیۆنیش سزای دا و ئەو گایەی شێت کرد، گاکە ئەوەندە ئەو دورگەیەیی وێران کردبوو وە مەترسی نابوویەوە، مینۆس بەڕێکەوت بۆلای هێرکول و داوای یارمەتی لە هێرکول کرد، هێرکولیش دوای نەبەردیەکی زۆر گاکەی کوشت.

## ئەسپەکانی دیۆمیدیس:



دیۆمیدیس کوڕی ئارس، پاداشای (بیستون)بوو، چەند ئەسپێکی هەبوو کە خۆراکی ئەم ئەسپانە گۆشتی مرۆڤ بوو، دەست و پێوەندەکانی پادشا ڕۆژانە چەند کەسیان دەکوشت تا گۆشتەکانیان دەرخواردی ئەو ئەسپانە بدەن،هێرکول خۆبەخشانە بەخۆی و چەند کەسێکی ترەوە چوو بۆ (تراکیا) ئەو ئەسپانەیان نیوەی کوشت و نیوەکەی تریشیان ڕام کرد بۆ خۆیان، بەڵام یەکێ لە چاودێری کارانی ئەسپەکان توانی بووی لەو هێرشەی هێرکول ڕزگاری ببێت و خۆی بگەیەنێتە لای دیۆمیدیس و هەواڵی هێرشەکانی پێ ڕابگەیەنیت و ئەویش بەلەشکرێکەوە هەڵمەتی بردە سەر هێرکول و شەڕێکی خوێناوی لەنێوانیان ڕویدا و سەرئەنجام هێرکول سەرکەوت و خودی کوری ئارسیشی دەستگیرکرد و وەک سزا هاویشتییە بەردەم ئەو ئەسپانەی کە گۆشتی مرۆڤیان پێشتر دەخوارد.

## کەمەربەندی هیپۆلیتا:



هیپۆلیتا شای ئامازۆنەکان بوو، ئامازۆنییەکان ئافرەتانی شەڕکەر و شەڕانگێز بوون، ئەمانە لە (قەوقاز)ەوە هابوون و لەسەر دەریایی سپی ناوەڕاست وڵاتێکیان بۆخۆیان پێک هێنابوو، هەمیشە هێرشیان دەکردە سەر هاوسێکانیان و هەموو ماڵ و سامانی ئەوانیان بەتاڵان دەبرد. ئەم ژنە شەڕانیانە وەک لە پێشترا باسم کرد، دوژمنی پیاوان بوون، هەریەکێک لە پیاوانیان بگرتایە دەیانکوشت، ئەم ئافرەتانە ئەوەندە ئازا و بێباک و چاونەترس و شەمشێر وەشێن و تیرهاوێژی کارامەبوون هیچ وڵاتێکی ئەو ناوە نەیاندەتوانی خۆیان لەبەردەم شەڕ و ئافاتی ئەم ژنانەدا ڕابگرن.

شای ئامازۆنەکان کەناوی (هیپۆلیتا) بوو، کەمەربەندێکی فەرمانڕەوای زێڕینی لە کەمەریدا دەبەست، کە ئارسی خواوەندی جەنگ بەدیاری بۆی ناردبوو، (ئادیمنا)ی کچی (ئۆریستا) زۆر حەزی لەبەدەست هێنانی ئەو کەمەر بەندە بوو، ئۆریستاش بۆ ئەوەی ئەو کەمەربەندە بۆ کچەکەی بەدەست بهێنێت و وە بۆ ئەوەش لەشەڕی هێرکول نەجاتی ببیت، فەرمانی بەهێرکول دا بچێت ئەو کەمەربەندەی هیپۆلیتای شای ئامازۆنەکانی بۆ بهێنێت.

لەم سەفەرەی هێرکولدا 3پاڵەوانی تریش بەناوەکانی( تیزا و تیلامۆن و ویلا) لەگەڵیدا بوون، جا دوای بوونە چوار و ئەم چوار پاڵەوانە سواری کەشتی بوون و بەڕێ کەوتن، دوای بەسەرهاتنی چەندین داستان بەسەریاندا کە مێژوو! دواتر ئەفسانەکان بۆمانی دەگێڕنەوە، گەشتنە سەر خاکی ئامازونەکان و چوونە لای شا، شای ئامازونەکان سەرەتا هیچ نارەزاییەکی دەرنەبڕی و تەنانەت ئامادەبوو کەمەربەندەکەی بداتە هێرکول، بەڵام (هێرا)ی هاوسەری زیو لەم سەرکەوتنەی هێرکول دڵگران بوو وە حەزی دەکرد هێرکول بە سەلامەتی لەسەر خاکی ئامازونەکان ڕزگاری نەبێت.

بۆیە پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە کە هێرکول بۆ ڕفاندنی شا هیپۆلیتا هاتووە، ژنە شەڕانیەکانی دەوری شا هیپۆلیتاش تیرەکانیان ڕاکێشا و نیشانەیان لە هێرکول و وەفدەکەی گرتەوە بۆ پاریزگاری لە شاکەیان، کاتێ هێرکول ئەمەی بینی، وێنای ئەوەی کرد فریوی خواردووە و تەڵەیان بۆ ناوەتەوە و دەیانەوێت بیکوژن، بۆیە هەڵگەڕایەوە و هێرشی کرد و شەڕی ترسناک دەستی پێ کرد و دوای کوشتن و کوشتارێکی زۆر  و پاشانیش هیپۆلیتای کوشت و کەمەربەندی لەگەڵ خۆی هێنا و گەڕایەوە.

## (گا)کانی گریۆن:



گریۆن ئەو کەسەی کە حوکمڕانی خۆرئاوای ناوچەکانی(ئایبری)[51] دەکرد، چەند کەڵەگایەکی ڕەنگ سووری هەبوو ئەو کە بە ئۆدیتۆنی گاوان و سەگی ئۆرتروسی سپاردبوو، ئەو یۆنانییە دەریاوانانەش کە چووبونە ئەوێندەر ڕاز و باسی ئەو گایانەیان گەیاندە گوێی (ئۆریستا)، ئەویش فەرمانی بە هێرکول کرد بچێ ئەو گایانەی بۆ بێنێت، هێرکولیش سواری کەشتی بوو بۆ ئەو شوێنە چوو گاوانەکە و سەگە پاسەوانەکە و دێوە سێ پایەکیش کە لەوێندەر بوو کوشتی و گاکانی لەگەڵ خۆیدا هێنا و لەڕێگای گەڕانەوەیدا ڕووداو و بەسەرهاتی ترسناکی بەسەرهات. سێ کوڕی پۆزیدیۆنی خوای دەریای کوشت کە خەریکی دزینی ئەو گایانە بوون و بۆ گێڕانەوەی گایێکیش کەلە ڕانەکە هەڵبڕابوو چوو بۆ دورگەی سیسیل و چووەلای پادشایی سیسیل کەناوی ئارکیس بوو و گەورەترین بۆکس وەشێنی ڕۆژگاری خۆی بوو و گوتی بەمەرجێک ئەو گایەت دەدەمەوە لەگەڵم بکەویتە شەڕە بۆکس و بێیتە مەیدان تەکما.

هێرکولیش بەمە ڕازی بوو دوای شەڕێکی زۆر (ئارکیس) بەدەستی هێرکول لەناوچوو، دوای ئەوەش لە نزیک دەریای (تراکیا)دا لەلایەن (هێرا)ی هاوسەری زیوسەوە مێش و مەگەز ئامادەکرابوون تا بەو گایانەوە بدەن و شێتیان بکەن، گاکانیش کە گەشتنە ئەو جێیە ، مێشەکان تێیان دان و هەریەکە بەلایەکدا هەڵهاتن، هێرکولیش زۆر بەدەردەسەری و نارەحەتی توانی گاکان کۆبکاتەوە، تاسەرئەنجام دوای چەند مانگێک لەچەشتنی ئازار و مەترسی گەیاندنیەوە دەست (ئۆریستا) ئۆریستاش ئەو گایانەی نارد بۆ پەرستگای هێرا و لەبەردەم دەروازەی هاوسەری ئەزەلی و ئەبەدی خواوەندانداندا کردییە قوربانی.

[51] خاکی ئیسپانیا و پرتوگالی ئەمڕۆکە.

## سێوی زێڕین:



جارێکی تر ئۆریستا هێرکولی ڕاسپارد بچێت بۆ سەفەرێکی درێژ و (سێوی زێڕین)ی بۆ بێنێت، کە هیسپرییەکان پارێزگاری لێدەکەن، هیسپرییەکان کچی خواوەند (ئەتڵەس) و (هیسپریس) بوون و لەباخێکی ئەفسانەیی خۆرئاوای ئەوروپادا خەریکی بەخێوکردن و ڕنینی سێوی زێڕین بوون، هێرکول سەرەتا بەهەڵە ڕێگای سەرووی گرتەبەر، دواتر بەڕێنمای پەریەکانی جەنگەڵ (تیزە)ی خوای غەیبگۆی دۆزیەوە و لەڕێگای ئەوەوە شوێنی ڕاستەقینەی باخی سێوە زێڕینەکانی پێگوت و ئیتر هێرکول لەڕێگای ئەفریقاوە چوو، سەرەتا توشی پاڵەوانی پەیکەر زەبەلاح بوو، کەڕێگای لە ڕێبواران دەگرت و ناچار بەزۆرانبازی لەگەڵ خۆی دەکردن، دوای ئەوە چوون بەهێز بوو، هەمیشە سەردەکەوت و دەی کوشتن، هێرکولیش توشی بەتوشیەوە بوو ململانێی لەگەڵ کرد و لەناوی برد، دوای ئەوە هێرکول کەوتە شەڕ لەگەڵ بوونەوەرانێک کە لەخەویدا دەیانویست بیکوژن، دوای سەرکەوتنی لەوێوە چوو بۆ میسر، فیرعەونەکان هەمووساڵێک کەسێکی بیانیان دەگرت و دەیانکردە قوربانی بۆ خواوەندەکانیان بۆ ئەوەی ڕێ لەقات و قڕی بگرن، هێرکول بێ ئاگایانە دەستگیرکرا و بەزنجیر دەستوپێیان بەستەوە و بڕیاریاندا بیکەنە قوربانی ئەو ساڵە. بەڵام هێرکول کەزانی دەیکوژن لەناو پەرستگاکەدا خۆی ڕاوەشاند و هەڵگەڕایەوە لێیان و زنجیرەکانی پچڕاند و فیرعەون و کوڕەکەی کوشت و درێژەی بەڕێگای خۆی دا، لەحەبەشەشدا (لوماتیۆن)ی ستەمکاری کوشت و (مەمنون)ی لەشوێن دانا و ئینجا سواری ئەو بەلەمە زێڕینە بوو کە خۆر خستبوویە ژێر دەسەڵاتی ئەوەوە، بەتیرێکیش ئەو هەڵۆیەی کوشت کە لەسەر کێوی (قەفقاز)دا جەرگی (پرۆمیتە)ی دەخوارد.

ئینجا کەوتە ڕێ بەسەردەریادا و ماوەیکی دورودرێژی پێ چوو تا گەشتە باخی هیسپریدەکان و لەوێدا ئەژدیهای بەناوبانگ(لادیون)ی کوشت کەلەسەر ئەو ڕێگایەدا بوو، ئینجا چووە نێو باخەکە و سێوەکانی بەدەست هێنا و هاتەوە و دانییە دەستی ئۆریستا، بەڵام ئۆریستا ئەو سێوانەی بەدیاری دایەوە بە هێرکول، هێرکولیش سێوەکانی دایە ئاتینای خوابانوی ئۆڵۆمپ بۆ ئەوەی ئاتینا ئەو سێوانە بگەڕێنێتەوە شوێنەکەی خۆیان[52] ، دەڵێن؛ هێرکول بۆ بەدەست هێنانی سێوە زێڕینەکان داوای لە (ئەتڵەس) کردووە و ئامادەی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی لە جێگای ئەتڵەس کە زەوی لەکۆڵی هەڵگرتووە زەوی لەکۆڵ بگرێت تا ئەتڵەس دەچێت سێوەکانی بۆ دەرنێت، بەڵام کاتێ ئەتڵەس گەڕاوەتەوە، ویستوویەتی خۆی لەو بارە قورسە ڕزگاربکات و نەیەتەوە ژێرباری زەوی، بەڵام هێرکول ئەوی دووبارە تەفرەداوە و کۆڵەکەی خستۆتەوە سەر پشتی.

## سەفەرکردن بۆ دۆزەخ:



کاتێ ئۆریستا بینی هێرکول لەهەموو سەفەرە مەترسیدارەکان بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە، کەوتە بیری ئەوەی بەهەرشێوەیەک بێت ئەو پاڵەوانە لەناو بچێت، بۆیە لە دوانزەهەمین داستانی ئەودا بڕیاریدا هێرکول بچێت(سربیرۆس)ی ئەژدیهای سێ سەری دۆزەخی بۆبێنێت، هێرکولیش ئەم کارە سەختەی قبوڵکرد، سەرەتا چوو بۆ ئالوزیس و لەوێ نهێنیەکانی دۆزەخی زانی، دواتر بەهاوەڵی (هیرس) ڕێگای دۆزەخی گرتەبەر.

[52] مەبەستلە (شوێنەکەی خۆیان) دۆزەخە.

ڕۆیی...ڕۆیی... بەرەو قولاَیەکانی زەوی، (تیزا) و (پریتیوس)ی بینی کە بەنەزانی خۆیان کەوتبوونە دۆزەخ و ڕزگاری کردن، بەڵام بومەلەرزەیەکی بەهێز هات و پریتیوس نەیتوانی ڕزگاری ببێت، دواتر هێرکول (ئیسکالافیوس)یشی ڕزگارکرد کەلەژێر تاشەبەردێکی زەبەلاحدا گیری کربوو.

ئینجا ڕوبەڕووی (هاوس)بوویەوە کە خوێنخۆرێکی دۆزەخ بوو، سەرئەنجام دوای ئەم نەبەردیانە خواوەندی دۆزەخ ڕازیبوو هێرکول ئەژدیهایی حەوت سەری دۆزەخ ببات لەگەڵ خۆی. بەمەرجێ بەبێ چەک و کەرەستەی شەڕی، واتە بەزۆری بازووی خۆی لەگەڵ ئەو ئەژدیهایەدا بکەوێتە ململانێ و جەنگ، هێرکولیش بەمە ڕازی بوو دوای شەڕ و پێکدادانی زۆر کە چەند ڕۆژێکی خایاند بەسەر ئەژدیهاکەدا زاڵبوو خنکاندی، ئینجا ملی ئەژدیهاکەی گرت و ڕایکێشایە سەر زەوی.[53]

---

[53] هەموو ئەم بەسەرهات و باسانەی هێرکولم وەرگرتووە لە کتێبەکانی:
( ئەفسانەی خواکان/ شوجاعەدین شیفا/ص149 تا166)
(الهەها و ایزدان/بە کوشش:امیر بهنام/ ص162تا164)

# (پریاپۆس)



به یۆنانی:Πρίαπος

به ئینگلیزی: Priapus

**پریاپۆس** لەئەفسانەکانی یۆناندا خواوەندی بەبرشتی باغ و بێستانەکان بوو وەخواوەندی کێری(ئالەتی زاوزێی پیاوان) بوو.

کوڕی دیۆنیسۆس و ئافرۆدیته بوو، باڵا و لەش و لارێکی بچوک و نوشتاوەی هەبوو بەڵام کێرێکی زۆر گەورەی هەبوو، به شێوەیەک ناشرین و نالەباربوو شیوەی که دایکی خۆی حاشای لێ کرد، عاشقی پەرییەک بوو بەناوی (لویتیس) لەکاتی خەوتنی لەگەڵ ئەم پەریەدا کەرێک زەڕاندی و ڕای چلەکاندن و پەریەکه هەڵهات لەترسدا، ئیتر لەو کاتەوە پریاپۆس ڕقی له کەر دەبوویەوە.

# (هیکاتە)



به یۆنانی:Εκάτη

به ئینگلیزی: Hecate

**هیکاتە** له ئەفسانەکانی یۆناندا، لەخوابانوانی دونیای ژێر زەمینییە، کچی (پرسس) و (ئاستریا)یە، هیکاتە زیاتر وەک خوابانوی ڕۆحی خراپ و پیس و خوابانوی ترس و تاریکی شەوان ناسێنراوە.

# (یاسون)



بە یۆنانی:Ἰάσων

بە ئینگلیزی:Jasón

**یاسون** یان جەیسۆن، یەکێکە لە پاڵەوانەکانی ئەفسانەی یۆنانی.

کوڕی (ئایۆن) و (ئالکمیدا)یە، وەیەکێکە لەڕابەرانی (ئارگونوت)[54]ەکان و هاوسەری (میدیا)ی ساحیری بەناوبانگی یۆنان بوو.

وێنەی کەشتی ئارگۆ:



[54]ئارگۆنوتەکان Argonauts کۆمەڵە پالەوانێک بوون کە بەڕابەرایەتی یاسون و بە کەشتیەک بەناوی (ئارگۆ) سەفەریان کرد بۆ دۆزینەوەی گەنجینەیەکی گەورە و لەکۆتایدا بەدەستیان هێنا.